## ناوەڕۆک

## بەر لە پێشەکی

خوێنـەری ئـازیز، ئـەم کتێبـە بچوکـەی بەردەسـتت بریتییە لە دەروازەی چوارهەم لە کتێبـی بۆچونـەکان لـە هونەری مۆدێرندا نوسـینی دکتـۆر مـەحمود ئەلبسـیونی. نوسەر لەم دەروازەیەدا سودمەند بوە لە بیروبۆچونەکانی ڕەخنەگری گەورە شمیدت دیجینەر. ئەوەی جێی سەرنجە لـەم نوسـینەدا بوێـری و ڕاشـکاوی بیرکردنـەوەو پێودانـگ کردنـی ئـەم ڕەخنەگرەیـە لـە پـاڵ لێکدانەوەیـەکی بابەتیانـەی پشت بەسـتوو بـە ئاڕاسـتەیەکی مێژوویـی. تێڕوانینێکی خێرا بەڵام چڕوپڕ بەرامبـەر هـەر بزاڤێکی هونەریی و هونەرمەندێ دەدوێت.

بەرهـەڤ بوونـی بەرەنجامـەکان لـە کـاریی هەنجەتەکانەوە سەرچاوە دەگرن، ئەمەش وای کردوە ئەم نوسـینە جیـابێت لـە زۆرێـك لـەو نوسـینانەی تەنـها گێڕانەوەیەکی مێژویی بۆ هونەری مۆدێرن لەخۆ دەگرن.

بـە مەبەسـتی زیـاتر گـەیاندنی بیروڕاکـانی نوسـەر ناچار بـووم بەرامبـەر هـەندێ وشـە ئـەو مانـا کوردییـە دابنێـم کـە خزمـەتی مەبەسـتەکەی کـردوە. هـەندێ جاریش گەڕاومەتـەوە بـۆ دانـانی وشـە ئینگلیزییەکـەی، گەر مەبەستەکە وەهای خواستبێت، یاخود بەرامبەر بـەو وشـەیە وشـەیەکی وەهـام چنـگ نەکـەوتوە ئـەو مانایـە

بپێکێت، بۆ نمونە: کۆمپۆزشن بەرامبەر (التکوین) یاخود کۆنستراکشن (الترکیب) و پرۆسێس (عملیة).

دەربـاری نـاوی ڕێبـازە هونەرییـەکان بـۆ زیـاتر ناسینەوەو شارەزابوون لە پاڵ ناوە عەرەبییەکەدا ناوە ئینگلیزییەکەم نوسیوە، بە پێی گونجاوی لە ڕستەدا یاخود گونجاوی ناوی ڕێبازە هونەرییەکە یەکێکیانم زیاتر بەکارهێناوە. بۆ نمونە (ئینتباعیەت و تەعبیریەت)م بەلاوە ئاشناترو ئاسان تر بوو وەك (ئیمپرێشنیزم و ئێکسپرێشنیزم) بەڵام (کیوبیزم و فۆفیزم)م بەلاوە پەسەندتر بوو لە (تەکعیبیەت و وەحشیەت).

لە هەندێ جێگەدا گەر پێویستی بە پەراوێز کردبێت بۆم داناوە لە پێناو زیاتر ڕوون بوونەوەی بابەتەکە.

بەو ئامانجەی ئەم هەوڵە سادەیە سەرەتایەك بێت بۆ کەمکردنەوەی ئەو بۆشاییە فراوانەی بە زمانی کوردی لەم بوارەدا هەیە، ببێتە مایەی چونە پێشەوەی چێژوەرگرتن و لێکدانەوەی جیدی بۆ بینەرانی هونەری شێوەکاری بە گشتی. تا خوێندکارانی هونەریش بە تایبەتی زانیاری و شارەزاییان لە سەرسام بوون بە ڕوکەشی تەکنیکی بێ تازێ و پانتاییەکانی بینگەی هونەریی بگرێتەوە.

ڕەنگە نووسینەکە جۆرێك لە مۆرکی تایبەتمەندی لەخۆ بگرێ ئەوەش ناگەڕێتەوە بۆ شێوازی نووسینەکە

یاخود بۆ ئەو زانیاریانـەی لـە دووتوێـی نووسـینەکەدایە، هێندەی دەگەڕێتەوە بـۆ خـودی کـاری هونـەریی مۆدێـرن کە لە لایەن و پێناوی تاکدا هەڵسوڕاوەو ئـەنجام دراوە لـە ڕۆژئاواش زۆرێکی لە (کارتیـاکردن و زەمـەن) ویسـتوە تـا پانتاییەکی زیاتری لە ئاستی گشتی بە دەست هێناوە.

ئەوەش بۆ خۆی مایەی پرسیار بـووە لـەلای دیجینـەر لە کۆتایی بۆچوونەکانیدا.

**وەهبی ڕەسول**

**٢٠٠٢/٢/١١**

## - پێشەکی:

هونەری نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە بە هونەرێکی ئاڵۆز دادەنرێت گەر بە هونەری ئاڵۆزی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەراورد بکرێت. ئەم سەردەمە رووبەرووی کۆمەڵێ شەپۆلی بێ ئارامی و هەڵچوون و داچوون بۆوە کە پاشماوەی جەنگە وێرانکەرەکان و ئەو شۆرشانە بوو کە ئاسەوارهایەکی ترسناک و هەلگەرانەوەی رامیاری و کۆمەلآیەتیان بە دوای خۆیاندا هێنا. ئەمە جگە لە گەشەسەندنی خێرا لە پرۆسێسە تەکنۆلۆژییەکان و دۆزینەوە زانستییەکان و داهێنانەکاندا. ئەم دیاردانە سەرجەم لە هونەری پەنجا ساڵی رابوردوودا رەنگیان دایەوە. لەم ماوەیەدا چەندان قوتابخانە بە دەرکەوتن و چەندانی تر دیارنەمان لە بەدوا یەك هاتنێکی خێرادا، کۆمەڵێ تیۆری و بیروباوەری نوێ دانران کە هەندێ جار بە توندی هێرشیان دەکرایە سەرو هەندێ جاری تریش بە توندی بەرگرییان لێ دەکرا، هەندێ لەم بیروباوەرانە وەلانران و کاتێکی درێژ بەسەر پەیرەویکردنیاندا رانەبورد، ئەمەش لەبەر دەرکەوتن و زاڵبوونی بیروباوەری نوێ تر کە جێیانی دەگرتەوە.

هەندێ جار ڕێڕەوی دژ بەیەك لە هەمان كاتدا لە دایك دەبوون، تەنانەت هەندێ نیگارکێش تیۆرێكی دیاریكراویان پەیڕەو دەكردو دواتر وازیان لێ دێناو بە تیۆرییەكی ترەوە پابەند دەبوون، بە شێوەیەك دانانی ئەم هونەرمەندانە لە خانەیەكی دیاریكراودا ئاسان نیە، ڕۆشنبیریی سەدەی بیستەم لەم حاڵەتە شێواو و ناڕێكەیدا كە بەرەنجامی شۆڕشكردن بوو بەسەر گشت بنەماو ڕێسایەكی باودا ڕەنگدانەوەی زیندوی خۆی لە هونەرەكانداو لەو گۆڕانكارییانەدا دییەوە كە تیۆری ئیستاتیكی ڕووبەڕووی بۆوە.

دەبێت دان بەوەدا بنێین كە جۆرەها لە ئەزموون و تیۆری لە ئارادا بوون. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە بە هیوای ئەوە بووین كە نیگاركێشەكان بە وردی و شێنەیی لە تێبینییەكەی ڕێنوار بكۆڵنەوە كە دەڵێت: "تیۆرییەكان ئەفرێنەری تابلۆ جوانەكان نین" لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبازە دیالەكتیكییە جۆراوجۆرەكان لە سەدەی بیستەمدا كارهایەكی هونەری گرنگ و سەرنج ڕاكێشیان بۆ بەرهەم هێناین. هەرچەند ئەم تیۆریانەی هونەری مۆدێرن و هەوڵدانەكانی جێی سەرنج بن تا چەندێ وێنا دەكرێت، بەڵام ئەو تیۆریانە خاوەن گرنگییەكی قوڵن چون گوزارشت لە هەڵچوونەكانی مرۆڤی نوێ و وەڵامەكانی هونەرمەند دەكەن بۆ دیاردەكانی سەردەمەكەی و گرفتەكانی خۆی.



پۆل گوگان، دو ئافرەتی تاهیتی، ١٨٩٩،رۆنی لەسەرکەنڤاس، ٧٣×٩٢ سم



ڤان کوخ، ژووری نوستنەکە، ١٨٨٩، رۆنی لەسەرکەنڤاس،٧٣×٩٢سم

## -فەڕەنسا ڕێخۆشکەرە:

فەڕەنسا بەوە ناوزەد دەکرێت کە یەکەمین پێگەیەکە هونەری نیگارکێشانی سەدەی بیستەمی بە شێوەیەکی جیاوازو ناوازە تیا بە دەرکەوێت، ئەمە بەشێك بوو لە زنجیرەیەك بیروبۆچوون کە فەڕەنسا ڕێگای بەرەو پێشکەوتنی پێخۆش کرد، هەر لە کۆتایی سەدەی پێشوودا بوو پەرچەکردار دژ بە قوتابخانەی ئینتباعی بە هەمەجۆر دەرکەوتنەکانیەوە ڕویدا، یاخود بە مانایەکی فراوان تر هەڵگیرسانی شۆڕشێك ڕووبەڕووی ئەو بیروڕاو لێکدانەوەیەی پشتگیری لە بوونی (ڕاستییەکی بابەتی لە سروشتدا) دەکات. دەکرێت تێبینی ئەوە لە هونەرمەندێکی وەك: ڤنسنت ڤان کوخ (Vincent Van Gogh) و پۆل گوگان (Paul Gauguin) و پۆل سیزان (Paul Cezane)دا بکەین.

لە کارەکانی ئەو هونەرمەندانەدا توخمی وەها هەیە کاریگەری لەسەر دانانی ئەو ڕێڕەوە کردوە کە تا ئێستا هونەری نیگارکێشان گرتویەتە بەر. ئەو هونەرمەندانە ژیانی خۆیان بە جەختکردنەوە لەسەر ڕوکەشی دەرەکی دەستپێکرد بە شێوەیەك کە پشت بەستوو بێت لەسەر خێراییەکی کاتی: ڤان کوخ لە دوا ڕۆژەکانیدا هونەرمەندێکی تەعبیری بوو و لە کارەکانیدا ژیانی پڕ

هەڵچوونی خۆی دەخستەڕوو. هەرچی سیزانیشە بنەماکانی قوتابخانەی تەکعیبی (کوبیزم) دانا کە هونەرمەندەکانی ڕووەو ڕێڕەوێکی کۆنستراکشنی ئەبستراکتی دەچوون. ئەمە لە ساتێکدا گوگان بە هێڵە دەرەکییە سادەکراوەکانی، و ڕووبەرە جوانە فراوانەکانی لە ڕەنگدا، بەبێ جەخت کردنەوە لە ڕەهەندی سێهەم، بەهای ڕوکەشی سادەی شتەکانی بەدەرخست، بەڵام بە ڕێگەیەکی کۆنستراکشن، داهێنانی تیاکرد بەمەش پێشینەیەکی بە هونەری هنری ماتیس (Henri Matisse) و فوفیزمەکان (وەحشیەکان) بەخشی.

ئەو سێ هونەرمەندە ئێمەیان گەیاندە، هونەرمەندانێك کە ڕەخنەگرەکان لە دوای پیشانگەیەکیان لە ساڵی ١٩٠٤ لە ساڵۆنی پایزە لە پاریس ناویان لێنان (وەحشیەکان) -لە گیانەوەری دڕندەوە[1]- ئەوان ئێمەیان گەیاندە یەکەم هەوڵی دیاریکراو بۆ ئەفراندنی جۆرێکی نوێ لە نیگارکێشان کە خاوەن مۆرکێکی ئازاد بێت. ئەمە سەرباری ئەوەی کۆمەڵێکی تر لە هونەرمەندان کە خۆیان بە پەیامبەران ناوزەد کردبوو پێش ئەوان کەوتبوون لەو میانەدا، بەڵام هونەرەکەیان بۆ ماوەیەکی درێژ نەیتوانی بەردەوام بێت. لە پێشڕەوەکانیان مۆریس دنیس (Mourice Denis)ە کە خاوەن ناوبانگە بەو وتەیەی کە دەڵێ "تابلۆ بابەتەکەی هەرچییەك بێت لە بنەمادا ڕێکخستنی شێوەو ڕەنگە لە قاڵبێکی ناوازەدا".

## -فوفیزمـەکان (وەحشـیەکان) لـــە سروشـــت دوور دەکەونەوە:

هەر هونەرمەندێکی سەر بە ڕێبازی فوفیزم خاوەن مۆرکی تایبەتی خۆی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هۆکارێکی هاوبەش کۆی کردبوونەوە، هەموو بە مەبەست لە لاسایی کردنەوەی سروشت دوورکەوتنەوەو وازیان هێنا کە ئەو لاسایی کردنەوەیە ئەفرێنراوی ئینتیباعیەکان بوو، هەرگیز هەوڵی ئەوەیان نەدا نیگاری دیمەنێك بکێشن وەك چۆن لە دەرەوە دەیبینن، هەرچۆن ئەوان هەموو تواناو وزەی خۆیان بەکارنەهێنا تا شتێکی واقعی لێ دروست بکەن هەر کاتێ بۆیان لوا. بەڵکو گرنگی پێدانی خۆیان ئاڕاستەی بەدی هێنانی واقعیەتێك کرد کە خۆیان ئەفرێنەری بن پێش هەموو شتێك. بێ ئەوەی شێوەکانیان هیچ پابەندبونێك بگرێتە خۆ بە کەشی ئاسمانەوە یاخود بە شێوەی درەختێکەوە، یا بە هەر کاریگەرییەکی دیار کە بکرێ سروشت بۆ چاوی بخاتەڕوو. هەرچۆن دواتر هەوڵیان دا جیهانێك لە ڕەنگ و هێڵ و ڕووبەر بخولقێنن کە ڕێساکانی لە خودی خۆیدا هەڵگرتبێ لە جیاوازی و ڕێککەوتن و ڕیتم. بە پەیڕەوکردنی ئەمە هونەرمەند لەسەرخۆ؛ لە پابەندبوون بە کۆپیکردنی شتەکانەوە وەك لە سروشتدا دەردەکەون؛ ڕزگاری بوو.



هینری ماتیس، خۆشتن لە ڕووباردا، ١٩٠٩-١٩١٦، ڕۆنی لەسەر کەنڤاس، ٣٨٩×٢٥٧سم



ئەندریە دیران، ماڵەکانی پانلیمێنت لەشەودا، ١٩٠٥، ڕۆنی لەسەر کەنڤاس ٧٨×٩٩سم

ئەم ڕێڕەوانە وەك تێبینیمان کرد، لە هونەری هەرکام لە گوگان و ڤان کوخ و سیزان دا هەبوو، بەڵام بۆ جارێکی تر لە بەشی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی فراوان بەکارهات و بە شێوەیەکی وشیارانەو پشت بەستو بە میتۆدەکان جێبەجێ دەکران: هونەرمەندەکان لە هەوڵی ئەوەدا بوون پوختە هونەرییەکەی بە تێری و بە مادە بنەماکەیەوە وەك چۆن ئەم سەردەمە لێیان داوا دەکات دەربخەن. دەوڵەمەنی و تێری ڕەنگی زێدەڕۆیی تیاکراوی تۆمارکراو لە لایەن فوفیزمەکانەوە، شێوە ئەندازەییە بنەماییەکان کە سپەرێك بوون لە بونیاتی نیگارکێشانی کیوبیزم دا ئەو گرنگی پێدانەش بەو شێوانەی لە ئامێر دەچن کە فیوچەریزمەکان وێنەیان کێشا. هەموو ئەمانە لە چەند لایەنێکەوە، بە هەوڵێك بۆ گەیشتن بە دەرخستنی بنەما سەرەکییەکان دادەنرێت. لە هەندێ لایەنی تریەوە بە ڕووکەشێ لە قەڵەم دەدرێ، بۆ ڕووکەشی ڕۆحی ئەو سەردەمە تورەو پڕ دڵەڕاوکێیە. هنری ماتیس (١٨٦٩-١٩٥٤) کە بە پێشڕەوی دیاری جوڵەی فوفیزم دادەنرێت و هونەرمەندێکی سەرەکییە کە هونەرمەندانێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەتەوە وەك: ئەندریە دیران (Andre Derain) و مۆریس فلامنك (Maurice Vlaminck) و جۆرج رووە (Georges Rouault) و ئۆتۆن فریز (Othon Friez) و ئەلبێرت مارکیە (Albert Marquet) رائول دۆفی (Raoul Dufy) و کەسانێکی

تـر لـە پێشـڕەوانی بـەناوبانگی فوتابخانـەی فەڕەنسـی مۆدێرن، نە خۆی و نە ئەوانـەش کـە لـە دوای ئـەو هاتن هـەوڵی ئـەوەیان نـەدا کاریگـەری بۆشـایی و قوڵـی بکەنـە گرفتێکـی سـەرەکی لـە پێکهاتنی وێنـەدا، بـەڵام لـە جێـی ئـەوە بایـەخپێدانی خۆیـان ئاڕاسـتەی کاریگـەری جووڵـە کرد کە هەرچیزیاتر جەختیان لەسەر دەکردەوە، لە ڕێی سنورە دەرەکییە گوزارشت بەخشەکانی شێوەوە (هەروەك گوگـان کـردی). یـاخود لــە ڕێــی ڕێککــەوتنی لێدانــی پەڕەمووچی سەرەو خوارەوە کە ڤان کوخ بەکاری هێناوە. لە ڕێی ئەمـەوە توانیـان وا لـە وێنـە بکـەن لـە حاڵـەتی جووڵـەدا بێـت، ئەمـەش لــە ڕێــی یـاریکردن بــە هێـڵ و ڕەنگەکان بە شێوەیەکی بەهێز.

لە سیزانەوە بەکارهێنانی ڕەنگیان وەك هۆکارێك بـۆ دیاریکردنی شێوە بۆماوەیە، بەڵام لە پاڵ نەخشی میسری و ئاشـوری(٢) و نەخشـاندن لـە سـەردەمی یۆنـانی کـۆن پەنایان بۆ شێوە سەرەتایی و کۆنەکانیش برد، هـەرچۆن کەڵکیان لـە نیگارکێشانی بێزەنتی و سەرانسـەر هونـەری ڕۆژهەڵاتی دیکەش وەرگرت. ماوەیەك لـە بەرهەمـهێنانی مـاتیس دا کاریگـەریی خـەزەفی فارسـی و دەستنووسـە وێنـەدارە فارسـییەکان دەبینـین کـە توانـی ڕەنگـی زاڵ لـە تـابلۆدا سادە بکاتـەوە. هـەمان شـتیش لەگـەڵ هێڵـەکان و شـێوە تەواوکـەرەکاندا بکـات و تـا ڕادەیـەکی گـەورە بیــان کاتـە ڕیتمێکـی سـەرەکی. ئـەو هـەرگیز دوودڵ نـەبوو لــە

دانانی رووبەری گەورە لە رەنگی سەرەتایی کە یەك دەچوونە پاڵ ئەوی تر، ئێمە نە لە کاری ئەودا (و نە لە هیچ کارێك لە کارەکانی هونەرمەندە وەحشیەکاندا) ئەو هەمەرەنگییە وردەکارەمان نەدی کە لە جەختکردنەوەی ئینتباعیەکاندا هەیە. هەرچۆن وەك پرۆسێسێك خۆی لە شێواندن لانەداوە، لەبەرئەوەی باوەری وابووە کە نەخشەسازی پێویستی بەوەیە. لە ساڵی (١٩٠٧)دا تابلۆ بەناوبانگەکەی (Luxe Calme et Valupte) پیشان دا کە سروشتی ئەم کارەی لە شیعرێکی بۆدلێر وەرگرتبوو بە ناوی "بانگهێشتێ بۆ کۆچ" لەم تابلۆیەدا ئافرەتێکی پیشان داوە چوار پەنجەی هەیە ئەم سەرپێچی کردنە لە رێسای ئەناتۆمی کردنی راستەقینە، شتێکی نامۆو سەیر نەبوو لە کارەکانیدا یاخود لە کاری هونەرمەندە مۆدێرنەکانی تردا. لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین ئەوەی ئێمە ناسیومانەو زانیومانە وەك شتێکی واقعی، بە شتێکی سەرەکی دانانرێت. ئەو بابەتەی ماتیس مەبەستی بوە تۆماری بکات بریتییە لە یاریکردنێکی زەخرەفی بە هێڵ و رەنگ. پرۆسێسی نواندنەکە بە شێوەیەکی لاوەکی دێت و لە خۆیدا ئامانجێك نەبوەو نییە. جارێکیان ماتیس پێشنیاری رێگەچارەیەك دەکات بۆ هەڵسەنگاندنی ئەم جۆرە کارکردنانە بگیرێتە بەر لە رێی ئەو وتە بەناوبانگەیەوە کە دەڵێ: (گەر روانیتە وێنەیەك پێویستە لە سەرت ئەوە لە بیرخۆت بەریتەوە کەچی دەنوێنێت).




راول دۆفی، سەما، ١٩١٠، کۆلینی تەختە، ٣١×٣١سم



ئەلبێرت مارکیە، لەڕۆژێکی بارانی پاریس، ١٩١٠
ڕۆنی لەسەر کانڤاس، ٩٠×١٠٦سم

لەگەڵ ئەوەشدا ماتیس زۆر دوور نەکەوتەوە لە شـێوەکان کـە بناسـرێنەوە، بـەڵکو وەك دڵسۆزی ڕێگـا تایبەتەکـەی خـۆی مایـەوە بـۆ سروشـت و مۆدێـل (نمونـە)، بـۆ ئـەم ویستەشی ڕەنگ تاقە هۆکاری بوو کە پشتی پێ دەبەست لـە بڕیاردانی هـەر کارێك لـە کارەکـانیدا. کارەکـانی لـە زۆربـەی کاتدا دەوڵەمـەندو هێمـن و لەسـەرخۆ و گـەش بوون. ماتیس توانی لە ڕێگەی پەیوەست کردنیانـەوە بـە هێڵی دەرەکییەوە، بگاتـە بـەرەنجامی بـەرز لـە داهێنـاندا. ئـەو دەڵێـت "هەسـتکردنێکی ڕەنگـی هەست بـە جیـهانی دەرەوە دەکـەم" ئـەم ئاماژەیـەش پوختـەی جەوهـەری قوتابخانـەی فۆفیزمـە. لـە نێـوان سـاڵانی (١٩٠٥-١٩١٠)دا هـەندێ لە هونەرمـەندان پەیوەسـت بـوون بـەم ڕێبـازە هونەرییـەوە بـەڵام دواتـر ڕوویـان کـردە ڕێبـازی تـەواو جیاواز، لـەو هونەرمەندانـەش جـۆرج بـراك (Georges Braque) بـوو. بـراك لـە بیست تـابلۆ زیـاتری نەکێشا کـە سـەر بـە ڕێبـازی وەحشـیەکان بێـت، بـەڵام مۆریـس دی فلامنك (١٨٧٦) توانی تـەرزێکی تایبـەت بـە خـودی خـۆی بـرەو پـێ بـدات کـە هـەرچی زیـاتر هاوسـەنگی لـە نیگارکێشانی دیمـەنی سروشـتیدا بێـت. وەحشـیەت بـە پەرچـەکردارێکی گرنـگ دادەنرێـت، دژ بــە پرۆسێسـی کۆپیکـردن کـە زۆر جـار بـە ئـەفراندنی هونـەرێکی فۆتۆگرافی کۆتایی دێت. بـەڵام دەرخسـتنی ڕەنگـە زەق و هەڵچووەکان جۆرێك لە گوزارشتی خودی دەوێت کـە پشت

بەستوو بێت بە ئاوێزەیەکی ڕووناککەرەوە. فەڕەنسییەکان بە تەواوەتی ڕێساکانی ئینتباعیەتیان لە یاد نەکرد، ئەمێستاش کۆمەڵێ هونەرمەند بەردەوامن لەسەر تەرزی ورەگیراو لە ویستی ئینتباعیەکانەوە بەلاّم لەگەڵ ڕێڕەوی کەسایەتی خۆیاندا گونجاندویانەو ڕێکیان خستوە. لەوانە پیر بۆنارد (Pierre Bonnerd) (١٨٧٦-١٩٤٧) کە هونەرەکەی ئەمڕۆ ڕێزێکی مەزنی لێ دەنرێ، لە بالاّیی و ڕاستگۆیی، هەروەها ئەدوارد ڤیلارد (Edward Vuillard) (١٨٦٨-١٩٤٠) کە هاوڕێی بۆنارد بوو کارەکانی دەربارەی چوونە ژورگەی یاخود دەروازەی مالاّنەو جیاییەکی بێ هاوتای لەخۆ گرتوە.

## -به‌ره‌و ڕێبازگه‌لێکی سه‌ره‌تایی ساویلکانه:

هنری ڕۆسۆ (Henri Roussau) (١٨٤٤-١٩١٠) كـه هـه‌ندێ جار ناوی له‌گه‌ڵ نیگارکێشه وه‌حشییه‌كاندا دێت به‌ڵام بـۆ خـۆی نمونـه‌ی دیارده‌یـه‌کی بێهاوتایـه لـه جیـهانی نیگارکێشـاندا، کـارکردن و شـێوازی ئـه‌و بـه نموونـه‌ی جوڵه‌یـه‌کی گواسـتنه‌وه داده‌نرێـت. لـه کۆتـایی سـه‌ده‌ی رابوردوودا چالاکیه‌کی له‌به‌رچاوی هه‌بوو، هه‌ندێ جار به فه‌رمانبه‌ری گومرگ ناوزه‌د کراوه. یه‌کێکه له‌و که‌سانه‌ی وه‌ك ئاره‌زوو خـه‌ریکی هونـه‌ر بـوون، لـه‌و هونه‌رمه‌ندانـه بـوه كـه پێیـان وتـون نیگارکێشـانی رۆژی یـه‌ك شـه‌ممه. ڕۆسـۆ خـۆی مامۆسـتای خـۆی بـوه، بـه هـه‌رحاڵ ئـه‌و خۆشبه‌خت بـوه له‌بـه‌ر پـه‌یڕه‌و نـه‌کردن و مـل نـه‌وی نه‌کردنی بۆ ئه‌و کۆت و به‌ندانه‌ی خواستی ئه‌کادیمی باو ده‌یسـه‌پێنێ، هـه‌رچۆن خـۆی بـه بـاری میتـۆده ئایدۆلۆجییه‌کان بار نـه‌کرد. هه‌ر ئه‌مه‌شه بۆته هۆیـه‌ك لـه‌و هۆیانـه‌ی وای لـه کـاره هونه‌رییـه‌کانی کـردوه بـه شێوه‌یه‌کی ساویلکانه‌ی سه‌ره‌تایی ده‌رکه‌ون، که قه‌شـه‌نگی گوزارشتی مناڵان و ئازادی و کراوه‌یی ئه‌وان وه‌رگرن. ئه‌و گوزارشـتانه‌ی کاریگـه‌ریی کـرده سـه‌ر ئـه‌و نـه‌وه پێگه‌یشتوه‌ی که ترسناکی نقوم بوون له بێ مانایی کێشه شێوه‌کارییه‌کاندا هه‌ڕه‌شـه‌ی لێ ده‌کـردن. کاره‌کـانی ڕۆسـۆ

سەرباری ئەمانەت و نەبوونی دەمارگیری تیایدا بەدەر نەبوو لە هەندێ دیاردەی ناتەواوی، بەلاّم بێگومان پەرچەکردارێکی شیاو بوو دژ بە خواستی ئینتباعیەکان.

کۆمپۆزشنەکانی ڕووی لە جەخت کردنەوە بوو لە دو ڕەهەندو، ڕێکخستنی توخمەکان و کەسایەتییەکان یەك لە پەنا ئەوی ترا بە شێوەیەکی ڕووکەشی هەروەك ئەوەی بڕڕابن و دانرابن لە پالْ یەکدا. و لەگەلْ ئەوەشدا نیگارکێشانی تا ڕادەیەك وشك بوو، بەلاّم بەدەر نەبوو لە توانایەکی ڕاستەقینە لە گوزارشت کردن. ئەو شێوازە هەستیارە پەتیە سادەیەی لە ڕەنگکاری و ڕەنگ دانانیدا وای کردبوو بتوانێ نیگاری ئەو ئەندێشە ساکارانەی پێ بکێشێ و لە کاریگەریی نادیاری ئەوان قولْتر بکاتەوە کە لە کەشی خەونهایەك دەچێت پڕ لە ئەفسون و خۆشی. بەلاّم توخمی ناواقعی لە کاری (فەرمانبەرە گومرگی)یەکەداو کاریگەری ئەو لایەنە پەیوەستە تا ڕادەیەکی گەورە بە بەرهەمی هەندێ لەو سریالیانەی لە دوا ئەو هاتن و ئەوانەی ئامانجیان پەردەلادان بوو لەسەر ژیانی ناوەکی یان ئەفراندنی کەشێکی دیاریکراو. ئەو سیفەتە سەرەتاییەی کارەکانی لە خۆیان گرتبوو ڕێخۆشکەر بوو بۆ سەرسامبوونی جەماوەر بە بەرهەمەکانی (هونەرمەندانی ڕۆژانی یەك شەممە) یاخود کە هەندێ جار ناوزەدیان دەکردن بە (سەرەتاییە مۆدێرنەکان). لە نمونەی ئەوانەش جیراندما مۆزس

(Gamille Bombois) و گامیل بومبواز (Gerandma Moses) ئـەوەی بـە دیقـەت بڕوانێتـە کارەکـانی ئـەم دوانـە یـا کارەکانی ڕۆسـۆ ئـەوە بـەدی دەکـات کـە چارەسـەرێکی گەشەسـەندنی هونـەریان بـۆ خۆیـان تێپـەڕاندوە بـە گەیشـتن بـە بـەرەنجامێك دژ بـە قـووڵ بوونەوەیـەکی ئیستاتیکی کە پشت دەبەستێت بە هیلاك کردنێکی زەیـن تا ڕادەیەکی گەورە.

### -کیوبیزم ( تەکعیبیەت ):

ڕەونەقی ڕێبازی وەحشیەکان لە ساڵی ١٩١٠ زیاتر بەردەوام نەبوو، تەنانەت ماتیس خۆی وازی لە ڕێڕەوە وەحشییە بنەڕەتییە ڕەسەنەکەی هێنا، ڕێگەیەکی هەرچی زیاتر میانڕەوی بۆ خۆی گرتەبەر لە نزیکی ساڵی (١٩٠٨). بە ماوەیەکی کورت دوای ئەوە جوڵەیەکی هونەریی نوێ سەری هەڵدا پێی دەوترا "کیوبیزم" کە کاریگەرییەکی فراوانتری هەبوو و ماوەیەکی زیاتریش مایەوە. کۆمەڵێکی نێونەتەوەیی ئەم ڕێبازە شێوەکاریەیان گرتەخۆ و توانیان بە شێوەیەکی دژ بە واقعیەتی بدەنێ و جیاواز لەو کەشەی ئینتباعیەکان ئەفراندبویان لە کارەکانیاندا. هونەرمەندەکان وایان لێ هات چیتر هەست بکەن شیکردنەوەی پرۆسێسی نیگارکێشان بە شێوە گشتییەکەی، بۆ سیمفۆنیاتی تیشکی، کە هەروەك کلۆدمۆنێ (Claude Monet) کردی بۆ نمونە، مانای دورخستنەوەی نیگارکێشانە لەهەر بنەمایەکی دیاریکراو، لەبەر ئەمە هەستیان بە پێویستی سەپاندنی ڕێسایەکی پەیوەندیدار کرد بۆ فۆرمەکان، یاخود جۆرێك لە کۆنستراکشنی بیناسازی. ئەو ئاماژەیەی "سیزان"یش (کە هەموو شتێك لە سروشتدا شتێك نییە ئەندازە نەبێت) خاوەن کاریگەرییەکی گەورە بوو لە

هاندانیان بەرەو بنیات نانی هونەرەکەیان بە شێوەهای ئەندازەیی سەرەتایی وەك شەش پالّو. هەر لەوەشەوە ناوی "کیوبیزم"[٢] پەیدابوو لەسەر بنەمای گرنگی دانێکی زیاد لە کۆنستراکشن.

لە پێشرەوانی ئەم بزاوتە هونەرییە پابلۆ پیکاسۆ (Pablo Picasso)ی (١٨٨١) بە نەژاد ئیسپانییە، کە وەك قوتابییەکی بچووك لە بەرشلۆنەوە هات بۆ پاریس. هەروەها جۆرج براك (١٨٨٢) کە هاوسەردەمی ئەو بوو، بە پێشەنگی ئەم بزاوتە دادەنرێت.

سیزان بە شێوەیەکی وردو درێژ باسی لە شەش پالّووەوە نەکردوە، بەڵکو ئاماژەی بە بنەمای بونیاتنان داوە بە بەکارهێنانی بازنە، قوچەك، لولەك. سیزان لە دیمەنە سروشتییەکانیداو تابلۆ ژیانە وەستاوە دروستکراوەکانیدا جەختی لەسەر ئەم باوەڕەی خۆی کردوە، بۆ نمونە ڕوی سێوێکی بازنەیی دروست کردوە کە دەکرا بیکاتە چەند ڕویەك، وەشاندنی پەڕەموچەکانی گوزارشت لە پتەوی بیناسازی لەشەکان دەکات. دواتر تەکعیبییەکان ڕێڕەوی سیزانیان بەکارهێنا، بەڵام بالآتریان کرد بە هەنگاوی دوورتر. ڕوەکانیان زیاتر کردو ڕێگەیان پێدا لەسەر تەرزێکی ئەندازەیی یەکتر ببڕن لەم بینینەوە هەر شێوەیەکی خاوەن سێ ڕەهەند دابەش دەبوو بۆ چەندەها شێوەی ئەندازەیی کە بە شێوەیەکی هاوڕێتمی لێکچوو یەك بەوی ترەوە پەیوەست بوو، لە

لایەنە زانستییەکەیەوە بە شیکردنەوەیەکی ئاوێتە کە بۆ توخمە سەرەتاییەکانی، یاخود کۆکردنەوەی توخمە سەرەتاییەکان لە ئاوێتەیەکی نوێدا.

لە قۆناغی سەرەتایی تەکعیبیەتی شیکاریدا، هونەرمەند بۆ نموونە گوزارشتی لە دەموچاوێك بە بەکارهێنانی شەش پالۆ لە بنیات نانیدا دەکرد، لەگەڵ پارێزگاری کردنی بە هەندێ سیفاتەوە کەوا دەکات ناسینەوەی شتێکی ئاسان بێت. دواتر هونەرمەند توانی بە خۆبەستنەوە بە بەکارهێنانی یەك ڕەنگەوە بەسەر گرفتی ڕەنگدا زاڵ بێت. هەموو گرنگییەکی ئاراستەی کۆنستراکشنێ دەکرد کە تیایدا گرنگی و بەهای سەرەکی بەدی دەکرد. دواتر هونەرمەند بە شێوەیەکی لەسەرخۆ دەستی کرد بە دەرخستنی جۆرێك لە هاوسەنگی و هاوتایی، لە نێوان جوانی پرۆسێسە ئەبستراکتییەکەو بنەما سروشتییەکەی لێی هەڵهێنجاوە.

## - پیکاسۆو کیوبیزم:

پابلۆ پیکاسۆ بە یەکێ لە سەرکردەکانی جوڵەی کیوبیزم دادەنرێت، هەرچۆن بێ هیچ چەندوچون و گومانێك بە مەزنترین کەسایەتی دیارو خاوەن کاریگەریی لەسەر هونەری سەدەی بیستەم دەژمێرێت. ئەمە جگە لەو هەموو کێشمەکێشم و دیالۆگەی کارە هونەرییە فراوانەکانی دەسوورێنێت. پیکاسۆ خاوەن کاریگەرییەکی دوو ڕەهەندە لەسەر تەواوی جیهان لە گشت جۆرەکانی هونەری شێوەکاریدا، ئەمەش لەبەر ڕەسەنێتی کەسایەتی و هەمەجۆری لایەنەکانی و هێزی ئەفرێنەری ئەو، ئەم هێزە ئەفرێنەرەی پێویستی بە لێتوێژینەوەی هەمەلایەنە هەیە. کەسایەتی ئەو زۆر ڕێڕەو و شێوازی پێشکەش کردوین کە قورس و گران دەکەوێتەوە تا بتوانین بیان خەینە ژێر تاقە ڕێڕەوێکی دیاریکراوەوە. بەڵام گرنگی و بەهای مێژوویی ئەو کە دوورە لە مشتومڕ کردن لەسەری، دەکرێت لەسەر دوو بنەما پێشکەش بکرێت: یەکێکیان پابەندە بەو ڕۆڵەی لە بردنە پێشەوەی کیوبیزم دا گێڕاویەتی و پریەتی لە توانای گەورە لە دوا جەنگی جیهانی یەکەمەوە.



ئەدوارد ڤیلارد، کچەلاوێك پیاسە دەکات، ١٨٩٠، رۆنی لەسەر کانڤاس، ٨١×٦٥سم



پێر بۆنارد، پێش شێو، ١٩٢٤، رۆنی لەسەر کەنڤاس، ٩٠×١٠٦سم

دووەمیشیان: دەربـاری لـە پێنـاو دانـەنانی هۆکـاری هەسـتکردنە لـە میـانی جێبـەجێکردنی میتۆدەکـانیدا. ڕەنگە سروشتی هەڵچوناوی ئەو بگەڕێتەوە بۆ نـەژادە ئیسپانییەکەی کە لایەنی ئاوەزی و میتۆدی نەیانتوانیوە لە هونەرەکەیدا بە سەریدا زاڵ بـن. وەك لەگـەڵ هەندێ لە هونەرمەندە مۆدێرنەکانی تردا ڕویـدا، لەگەڵ گرنگی دانـی بـە کێشـەکانی سـنعەت و دروسـت کردنەوەشـدا. تەنانەت ئەو بە یەکەمین کەسێك لەوانە دادەنرێت کە ئـەم کێشـانەیان جولانـدەوەو ئـارۆژاندوە تـا چارەسـەرهایەکی نوێی زینـدوی بـۆ بدۆزنـەوە، ئـەو بـۆ خۆی خاوەن میزاجێکە کە سەر بۆ هیچ ڕێڕەوێکی دەست نیشان کراو نەوی ناکات. پیکاسۆ سەرەتای ژیانی هونەری خۆی بـە لاسایی ئاسایی پەیکـەرە ئاسـەوارییەکان و بـە نیگارکێشانی مۆدێل واتە (نمونەی زیندو) دەست پێکـرد، ئەمـەش جۆرێك لـە پراکتیکی توێژینـەوەی ئەکادیمییە. ئـەو دەمـەی هات بـۆ پـاریس سـاڵی (١٩٠١)، خـاوەن توانـاو ئاسـتێك و گرنگیدانێکـی وەهـا بـوو کـە بتوانـێ ئەزمونەکانی دەست پێ بکـات، بـێ ئـەوەی کـەس وابزانـێ ڕاست ناکات لە هەوڵدانـەکانیدا. لـە نیگارکێشانی هـەندێ دیمـەنی ژیـانی پاریسی جـەنجاڵیان دەنوانـد کەوتـە ژێـر کاریگەری (تۆلۆزلۆتریك)ەوە، بەڵام هێنـدەی نـەبرد چـوە سـەر کێشانی چـەند دیمـەنێك کـە تیشـکی هـەڵچونێکی بەهێزی دەدایەوە. ئامادەیی پێگەیشتوی لـەو کارانـەیـدا

دەرکـــەوت کـــە کەســـایەتی ئەکتـــەرەکان و لێبـــۆك و هـــەژارەکان و مۆســـیقییەکانی تیـــا تۆمـــار کـــرد. ئـــەم دیمەنانـەی بـە وردەکاری و خۆهیـلاك کردنێکـی زۆرەوە ئەنجام دەداو ڕەنگی شینی بەکاردەهێنا کە بـۆ ماوەیـەکی درێـژ لـە ڕەنگە شایستەکانی ئـەو بـوە لـە نیگارکێشـاندا. خـەمۆکی بـوە مۆرکـی ئـەم کارانـەی، بـەڵام نـەك خەمۆکییەك جۆرێك لـە شـپرزەیی و غـەمباری تیـا بێـت کە ئەم دوو حاڵەتە سیمای جیاکەرەوەی کۆتـایی سـەدەی نـۆزدە بـوون. وا دەردەکـەوێت پیکاسـۆ لـەم کارانەیـەدا توانیبێتـی یەکخستنێ لە نێوان ئـەو لایەنـە ڕەڤانییـەی "ئـەلگریکۆ" (Elgreco) تۆمـاری کـردووەو ئـەو تاڵییـەی "تۆلۆزلۆتریك" گوزارشتی لێکردووە بکات.

ئـەو پیشانگەیانەی کارەکانی "ڤان کـوخ و گوگـان و سـیزان"ی لـە خۆگرتبـوو لـە پـاریس دەکرانـەوە، لـە سەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا چەقی گرنگیدانی خەڵکی بوو. کارەکانی ئـەو هونەرمەندانـە توانیـان لـە پرێکدا ئاسـۆی نـوێ بکەنـەوە، سـروش بەخشـێکی خـاوەن کاریگـەری زیندووبوون بۆ نەوەی نوێ. لەم ماوانەدا کەس نـەیتوانی لە دەست کاریگەری "سیزان" دەرچێـت، بـەڵام "مـاتیس" و هونەرمـەندانی تـر کـە هاوڕێبـازی بـوون، سەرسـامی ڕێکخستنەوە نەخشـی (زەخرەفـی)یـەکانی نێـو کارەکـانی "گوگان" بوون و بە هەڵقوڵینی ڕەنگەکانی ناو تابلۆکانی "ڤان کوخ" سەرسام بوون. بەڵام "پیکاسۆ" گرنگیپێدانی

خۆی ئاراستەی قوڵ بوونەوە لە کێشـەکانی کۆمپۆزشـن و کۆنستراکشن کرد، وەك ئەوەی "سیزان" لـە هونەرەکـەیدا وروژاندبووی، لەو ڕۆژگارەدا دۆزینەوەیەکی نوێ بوژایەوە لـە پـاریس لـە سـەرچاوەیەکی تـەواو پێچەوانـەوە، کـە کاریگـەری لەسـەر هـەمان لـە کێشـەکان هـەبوو، ئـەو دۆزینەوەیـەش پەیکـەری زنجـی ئەفـەریقی بـوو. ئـەم دۆزینەوەیـە بـوە جێـی گرنگـی پێـدان و چـاودێری هونەرمەندان و بە دڵگەرمییـەوە پێشوازیان لێکـرد، هـەر چۆن پێش پەنجا ساڵ لەو مێژوە بە هەمان دڵگەرمییەوە پێشـوازیان لـە چاپەمەنییـە یابانییـەکان کـرد. ئـەم گەرموگوڕی و دڵگەرمییە ڕقێکی لـەخۆدا هـەڵگرتبوو بـۆ ئـەو پـەروەردە زێدەڕۆیـەو ئـاڵ و واڵا ڕوکەشـییەی لـە کلتـوری خۆرئـاوایدا هەیـەو وای کـردوە لـە دەرچونێکـی سروشـتی ڕاسـتەوخۆ بێبـەش بێـت و لـە دەسـتی بـدات. هـەرچۆن ئـەو هەسـتەی لـەخۆ گرتبـوو کـە زوبانـە شـێوەکارییەکەی ژیـان و مانـای ون کـردوە. هـەڵاتنی "گوگان" بـەرەو بەهەشـتەکەی لـە دورگـەکانی دەریـای خـواروو، بەڵگەیەکـە لەسـەر ئـەم ڕێـڕەوە. هـەرچۆن هۆکارێك بـوو بەخشینی هـەوڵێکی زۆر لـە پێنـاو گـەڕان لەنێو هونەرە سەرەتاییە بێگانەکاندا بـۆ چارەسـەرێك بـۆ ئەوروپای دەردەدار.



هینری رۆسۆ، خەون، ١٩١٠، رۆنی لەسەر کەنڤاس، ٢٠٤× ٢٩٨سم



پابلۆ بیکاسۆ، ئافرەتانی ئەڤینۆن، ١٩٠٧،رۆنی لەسەر کەنڤاس،

٢٤٣،٩ ×٢٣٣،٧سم

### -کاریگەریی پەیکەری زنجی:

گەر بە شێوەیەکی هەرچی زیاتر وردبینانە لە پەیکەری زنجی بدوێین و گوزارشتی لێ بکەین، دەتوانین بڵێین ئەم جۆری پەیکەرە توانی هێزێ بە دەست بێنێت لە ڕێی بەکارهێنانییەوە بۆ شێوەهای ئەندازەیی سادەکراوەو ڕاشکاو، بەڵام بەلای "پیکاسۆ" و "براك"ەوە ئەم پەیکەرە جەخت کردنەوەیەك بوو لە وانەکانی "سیزان" و یارمەتی دەر بوو بۆ دەرکەوتنی دوا دیمەنێ کە کیوبیزمەکان هێنابوویان، وەك بیرۆکەیەکی دیاریکراوی تەواو. بە دوا ئەمەدا کیوبیزمەکان هەوڵی گۆڕانی ئەم ئەندازە بەرجەستەیەیان دا بۆ ڕوویەکی دوو ڕەهەندی، هونەرمەند لە ڕێی دیراسەکردنەوە توانی دەست پێ بکات. دواتر سەرکەوتنی لە گەیشتن بە (کەرتی ڕوون) بە دەست هێنا کە ڕووبەرە خاوەن شێوە جیاوازەکان و ڕێڕەوە ئەندازەیەکان تیا یەکتر دەبڕن. پەیوەندی نێوان ئەو شێوانە بیرۆکەی سەرەکی کارە هونەرییەکە پێك دەهێنێت. لەسەر ئەمەوە ئەنجامی کۆتایی ڕوو بەرەو دوورکەوتنەوە دەنێت لە جیاکردنەوەی ئەو توخمەی کە گۆڕاوە بۆ هەیکەلێکی ئەندازەیی ڕاگیراو لەسەر بۆشایی، لە بیرۆکەیەکی وادا (هەروەك لای فوفیزمەکان هەیە) گرنگی دان ڕوو لە

میتۆدێکی ئیستاتیکی خاوەن ڕێسای تایبەت بە خۆی دەکات کە جیاوازییەکی هەمەکی هەیە لەو ڕێسایانەی کە ئاسایی جێبەجێ دەکرێت لە لاساییکردنەوەی دیمەنی دەرەکیدا. لە تابلۆی (ژنانی ئەفینۆن)ی پیکاسۆدا (کە لە مۆزەی هونەری مۆدێرنی‌نیۆیورکە ساڵی ١٩٠٦-١٩٠٧) دەکرێ تێبینی کاریگەری پەیکەری ئەفریقی بە ئاشکرا بکەین لە هەموو ئەو ڕوە خاوەن گۆشە تیژانەدا کە بنەما کیوبیزمەکانی تیا لە شێوەی کۆرپەیەکی نێو منداڵدان بە دەردەکەوێت. هەروەها لە تابلۆی (ژنێکی دانیشتوو) (کۆمەڵەی بنروز ساڵی ١٩٠٩) بیردۆزی کیوبیزم ڕسکا و لەم ماوەیەدا نیگارکێشان سەرکەوتنی بە دەست هێنا لە پێشکەش کردنی هۆکاری زەمەن (کات)دا وەك یەکێك لە ڕەهەندەکان. هونەرمەند هەوڵی تۆمارکردنی ڕووی جیاوازی بۆ توخم یاخود دیمەن دا، زۆر لەوە زیاتر کە بینەرێکی ئاسایی بە چاوی خۆی دەیبینێت لە کاتێکی دیاریکراودا. ئەم بیرۆکەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی دیکارت (Descartes) پێشتر لە وتەیەکدا وروژاندبووی کە دەڵێت: "گشت پنتەکان سەنتەرن و دەشێت بۆ تێبینی بەکرابهێنرێن" ئەم بیرۆکەیە بە جێبەجێ کراوی بە شێوەیەکی ئاڵۆز لە نیگاری فوفیزمەکاندا دەرکەوت کە لە چەندەها گۆشەو ڕووی جیاوازەوە لە یەك کاتدا بەرهەم هێنراوە، بەڵام تابلۆی سێ مۆسیقیەکە (مۆزەی فیلادلفیا) دوا ساتەکانی خواستی فوفیزمانەی "پیکاسۆ" دەنوێنێت،

زیاتر بەرەو ڕووکەش بوونەوەو ئەبستراکت چوە. هونەرمەند ئەم سێ کەسایەتییەی لە گۆشەیەکی بەرامبەری ئاساییەوە دروست نەکردوە. بەڵکو وەها لە تابلۆکەیدا دایناون وەك ئەوەی لە هەموو لایەکەوە سەیری کردبن و بیان بینێ. کۆمپۆزشنی کارەکەی لە ئەنجامدا لێوان لێوە بە ڕەنگ و تواناو پتەویی. "پیکاسۆ لە ماتیس" بزێوتر بوو کە خۆی لە هونەرەکەیدا بۆ سادەکردنەوەی شێوە سروشتییەکان تەرخان کردبوو. "پیکاسۆ" هەستا بە تێکشکاندنی شێوە سروشتییەکان لە ڕێی جۆرە تەڤینەوەیەکی بینینەوە، ئەوەش لە پێناو دووبارە ڕێکخستنەوەی پارچەکانی ئەم تەڤینەوەیە بەو شێوەیەی کە لەگەڵ ویستی ئەودا بگونجێ. "پیکاسۆ" هەمیشە لە پێشڕەوایەتیدا بوەو کۆڵ لە ئەزموون کردن نادات هەتا ئەمڕۆش لەسەر ئەو پەیمانەی خۆیەتی. بە سانایی ناتوانین لە کارەکانی تێ بگەین، هەرچەندە ئەو ڕاستەوخۆ ناوبەناو دەگەڕێتەوە سەر نیگارکێشان و بەرجەستەکردنێ کە شێوەیەکی ئاسایی بنوێنێ. بەڵام تا چەندێ پیکاسۆ دەتوانێت گوزارشت لە هەڵچونێکی قووڵ بکات؟ دەکرێت وەڵامی ئەم پرسیارە لە تابلۆی بەناوبانگی (جۆرنیکا)دا بدۆزینەوە. کە جەنگی ئیسپانی ئەهلی ئەفراندی. هونەرمەند ئەم تابلۆیەی ساڵی (١٩٣٦) کێشاوە ئێستا لە مۆزەی هونەری مۆدێرنە لە نیویۆرك. لەم تابلۆیەدا تۆقین و توندوتیژییەکی وەها دەردەکەوێت کە

تانەیە لەسەر سەردەمی نوێ. لەوێدا پەیوەستییەك هەیە لە نێوان باری تێكشكاوی شـێوەكان و ئـەو وێرانەیـەی كـە مەدەنیەتی نوێمان هێناویـەتی. هـەرچی هێماكانیشـە كـە پرۆسێسـی وێرانكارییەكـەیان ڕازاندۆتـەوە، وێنـای مۆتەكەیەكـە كاریگەرییـەكی درێـژو دووری لەسـەر هەڵچوونـەكان دەبێـت، زۆر زیـاتر لـە هـەر نیگـارێكی ئـەكادیمی كە مـرۆڤ بشێت وێنـای بكـات بـۆ دیمـەنێكی وەها. گاكە ئـەو توندوتیژیە دەنوێنـێ كـە لـە سـیفاتی فڕۆكەوانـە نازییـە فاشسـتەكانە، ئەوانـەی بـارانی تەقەمـەنییان بەسـەر شارەكەدا باراند. ئەسـپەكەش كـە بریندارە تا سەر مەرگ هێمایە بـۆ خـاكی ئیسپانیا، ئـەو كەللـە سـەرەی هـاوار دەكـات و ئـەو دەسـتەی چراكـەی هـەلگرتوە، ئاماژەیـەكن بـۆ ویژدانـی مرۆڤایـەتی كـە ڕووناكی دەخەنە سەر ئەو كارەساتەو مەحكوم و ڕیسوای دەكەن، لە هەمان ساتدا تێبینی نارەزایی لـە هـەر هێڵێك لـە هێڵەكانی ئـەم پێكهاتـە وێرانكـەرە دەكـەین. پیكاسـۆ هەندێ جار بەهرەمەندی خۆی لە مادەی كاركردنەكەیدا بـە وریـایی و زیرەكییـەوە بـەكارهێناوە. لـێرەدا ئـەوە دەسـەلمێنێت كـە دەتوانێـت هۆكـارە گوزارشـتییەكانی هاوئاهـەنگی مەبەسـتە جیدییـەكان بكـات، لـە پێنـاو كۆستێكی بە زەبردا.

ڕێبـازی كیوبـیزم بـە خـێرایی لـە بڵاوبونـەوەدا بـوو. ئەندێشەی زۆرێك لە هونەرمەندانی بـە ڕەگـەز جیاوازی

ئەم ڕێبازە بە چەندەها وێنە دەرکـەوت، وەك بـەرەنجامی هەمـــەجۆری و جیـــاوازی توانـــای هونەرمـــەندەکان لـــە داڕشتنەوەی جیهانی بینراو بــە ڕێگەی جیاجیا. هـەندێ جـار هونەرمــەند لەسـەر توخمێـك یـاخود ئـەو کەسـە دەمێنێتـەوە کـە سروشـتی کۆمپۆزشـنەکەی لیٚ وەرگرتـوە. بـە جۆرێك بتوانـرێ بنەڕەتییەکـە بناسـرێتەوە. هـەندێ جـاریش دووبـارە چـەند پارچەیــەکی کەســەکە یــاخود توخمەکە ڕێك دەخرێتەوە لـە هەندێ لە گۆشـەکانییەوە بـە شـێوەیەکی کاریگـەر. هەندێ جاری تریــش نواندنــی یاخود دەرخستنی  گشتی شتەکە فـەرامۆش دەکرێت، لـە بری ئەو ئەبستراکتێکی سەراپاگیر بەدەردەکەوێت.



ئەلگریکۆ، ناشتنی دیوك ئۆرگاز، ١٥٨٦، رۆنی لەسەرکانڤاس،

٨٧ ×١٠٨سم



پۆل سیزان، پیاوێك لە کراسێکی شیندا، ١٨٩٦-١٨٩٧،

رۆنی لەسەرکەنڤاس، ٨١×٦٤سم

-براك:

"جۆرج بـراك" بـه یـەكێ لـه پێشـڕەوانی كیوبـیزمی فەڕەنسی دادەنرێت، هەرچۆن یەكێك بـوە لـه لایـەنگرانی فوفیزمـەكان لـه سـەردەمانێكی كورتـدا. "بـراك" لـه پێشڕەوەكانەو لێهاتویی ئەو هەر له سەرەتاوە دەركـەوت، له هەست كردنـی لۆژیكیانـەی بـه كۆنستراكشـنێكی دیـارو ئاشـكراو هـەڵبژاردنی ڕەنگـی جـوان و گونجـاو. دواتـر كارەكانی به مۆركێكی ئەبستراكتی كـەمترەوە دەركـەوتن، توخمـه ئەندازەییـەكان دیـار نـەمان، ناسـینەوەی ئـەو بابەتانـەی گوزارشـتی لێ دەكـردن بـوە شـتێكی ئاسـان. "براك" لەو كارانەیدا كه دەرباری (ژیانی وەستاوە) و لـه پێوانـەی بچووكـدا دروسـتی كـردون ئـەو هەسـتەی پـێ نەبەخشین كه ئـەو هونەرمـەندێكی شۆڕشـگێڕە. بـەڵام ژیانی خۆی تـەرخان كـرد بـۆ هونەرەكـەی كـه هەسـتێكی ڕەمەكی بۆ بەها ئیستاتیكییەكان پێ بەخشی و هـەڵگری مۆركێكی فەڕەنسییانە بوو.



جۆرج براك، مۆمدان ویاری كاغەز لەسەر مێز، ١٩١٠، رۆنی لەسەر كانڤاس، ، ٦٠×٥٤سم



فرنارد لیجیه، ئاهەنگ ، ١٩٥٤، ٣١×٢٦ ئینج

**-ليجيه :**

هونەرمەندەكان بەو ئامادەییە تاكڕەوییە جیاجیایانەی هەیان بوو، توانیان بە شێوەی جیاواز ئەو مەرج و ڕێسا گشتییانە داڕێژنەوە: "فرناند لیجیە" (Fernand Leger) كە هەمان شت هونەرمەندێكی فەڕەنسییە شێوەی لولەكی و قوچەكی بەكارهێنا وەك دەردەكەوێت لەو كارەیدا بەناوی (بانیژە- زیورخ كۆمەڵەی دكتۆر فریدریك). لە دوای جەنگی جیهانی دوەمەوە ئەم هونەرمەندە كەوتە ژێر كاریگەری ئەو پەیوەندییەی نێوان شێوە ئەفرێنراوەكانی كیوبیزم، ئەو بەرهەمانەی خاوەن شێوەیەكی ئەبستراكتی بوون و مەدەنییەتی پیشەسازی بەرهەمی هێنابوون. توانی چەندان كۆمپۆزشنی زەخرەفی جیاجیامان بۆ بە ئەنجام بگەیەنێت، لە توخمهایەك كە لە بەرهەمە ئامێرییەكان دەچوو. كەس ناتوانێت كاری ئەو بە هەڵە وەربگرێت و وابزانێ لە كارەكانی هونەرمەندی ئیسپانی "خوان غرێس"ە (Juan Gris) (١٨٨٧-١٩٢٧)، كە ماندۆلین و قیسارەی بەكارهێناوە وەك بیرۆكەیەكی سەرەكی كتومت چۆن "پیكاسۆ" وەهای كرد، بەڵام ئەم ئەو بیرۆكەیەی بە شێوەیەكی بێهاوتا دەرهێناو بە وێنەیەكی كامڵ كە لە هزری خۆی ئەفراندبوی دەرباری كیوبیزم لە چارەسەری

بابەتـــــــــە وەســــــــــتاوەکاندا (مەبەســــــــــت بابـــــەتی Still life)ە. هونەرمـــــەندێکی تـــــر هەیـــە بـــە نـــاوی "جینۆسیڤرینی" (Gino Severini) بە ڕەگەز ئیتالییەو لـە هـەموو هونەرمـەندەکانی تـر جیـاوازە بـە بـەکارهێنانی ڕەنگی کاڵی کاریگەر.

هەندێ هونەرمەند ئەوەندەیان نـەبرد دەسـتبەرداری کیوبـیزم بـوون، ئەمـە لـە کـاتێکدا هـەندێکی تریـان کاریگەرییـەکی تیـژ تێپـەڕی تێکـردن، هونەرمـەندی فەرەنسی "ئەندریە دیران" کە نزیـك بـوو لـە "پیکاسۆ" بـەرەنجامی کاریگـەری تـەرزی ئـەندازەیی لـە سـەری بـۆ ماوەیـەك ئـەو ڕێچکەیـەی گرتـەخۆ. "دیـران" ڕەنگـە بـەهێزەکانی بـەکاردەهێنا کـە فوفیزمـەکان بـۆ ماوەیـەکی دیاریکراو بەکاریان هێنا، بەڵام گەڕایەوە سـەر ڕێگەیـەکی نمایشـکاری لـە نیگارکێشـــاندا ئـــەو دەمـــەی کاریگـــەری "سـیزان" و هـێزی کیوبیزمـەکان و سەرسامبوونی پێیـان بەری دا.

## -لە کیوبیزمەوە بەرەو ئەبستراکت:

خوێنــەر لــە میتــۆدی کیوبــیزمدا ســاتێ دەگاتــە کۆتاییەکەی، ئەوە بە دی دەکات کە دەشێت ببێتە مایەی چون بــەرەو ئەبســتراکتێکی تــەواو و لــەم ڕۆژگارەمــاندا پەیرەو دەکرێت و پێی دەوترێت هونەری نابابەتی یاخود هونـەری پــەتی. ئــەم هونــەرە هــەموو پابەندییــەك بــە ڕووکەشـی سروشـتییەوە ڕەت دەکاتــەوە. هیــچ توخمێـك بــەکارناهێنێت بتوانــرێ بناســـرێتەوە، تەنانــەت وەك شتهایەك بکرێ دەسـتی پـێ بکرێـت. ڕیتـم لـە هێـڵ و ڕەنگدا بە پێی ئەم ڕێبازە زێدەڕۆیە، پێویستە گوزارشت لە هەستی ئیستاتیکی هونەرمەند بکات بە شـێوەیەك کـە لـەوە دەچێـت لـە مۆسـیقادا ڕوودەدات. پێشــەوای ئــەم هونـەرە ئەبسـتراکتی (تجریـدی)یـە "واسـیلی کاندنسـکی" (Wassily Kandinsky) ڕوسـییە (١٨٦٤-١٩٤٤) کــە خــاوەن کاریگەرییـەکی مەزنــە لەســەر نەوەیــەك بــە گشـتی لــە هونەرمــەندان، هــەتا ئــەمڕۆش ئەبســتراکتییەکان لەســەر ئــەوە دەژیــن کــە لــەوەوە بۆیــان ماوەتــەوە. یەکــەمین کاریگـەری هـزری ئـەم هونەرمـەندە ساڵی ١٩١٠ دەرکـەوت، وەختــێ کتێبێکــی دانــا دەربــاری توخمــی (ڕوحــی) لــە هونـەردا ئاڕاستەی هاوڕێیانی و لایەن گیرانی کرد.




چینۆ سیڤرینی، کارگوزاری نەخۆشخانە، ١٩١٥، ١١٧×٩٠سم



جۆرج رووە، لێبوك، ٣٤×٥٠سم ،رۆنی لەسەر بۆردی مقەبا

-بزاڤی تەعبیریەت (ئێکسپرێشنیزم):

نیگارکێشانی پەتی دەکرێت توێژینەوەی لە بارەوە بکرێت، وەك یەکێك لە دیاردەکانی بزاڤی تەعبیریەت کە لە ئەڵمانیا سەری هەڵدا. سەرهەڵدانی هاوکات بوو لەگەڵ هەردوو ڕێبازی فوفیزم و کیوبیزم لە فەڕەنسا. کێشەکە وەها بەدەرکەوت وەك ئەوەی ئەم هەوڵە یەکخراوانە ئاماژەیەك بێت بۆ هونەرمەندانی ئەوروپی، تا شۆڕش بکەن بەسەر شێوازە زانراو و ناسراوەکانی نێو نیگارکێشاندا. ڕێبازی تەعبیریەت سەرباری ئەوەش ئاوێنەیەکی دڵەڕاوکێ و گرژی و ئازاری بڵاوی نێو تاکە کەسە هەستیارەکانی کۆمەڵگەی نوێ بوو. ئەو هەڵچونانە زیاترین شتێك بوو کە هونەرمەند، ئەو هونەرمەندەی سەنتەرێ بوو بۆ گرژییە دەمارگیرییەکان گوزارشتی لێ دەکرد، سەرنجی بۆ ئەو ئازارانە ڕادەکێشا کە ڕووداوە ڕامیارییەکان دەیخەملێنن، هەرچۆن بێ بڕوایی ئاشکرای هونەرمەند بە ڕژێمی ناسراو و گەڕانی هەمیشەیی بە دوای ڕێڕەوێکی نوێدا کە لێی دوایین لە فەرەنسادا، یارمەتیدەر بوو لە هەرچی زیاتر دەرکەوتنی هەڵچونەکانی هونەرمەند. ئەمە سەرباری وەرگێڕانی ئەم هەڵچونانە بە شێوەیەکی ڕوون بۆ تێڕامانی جوانی پەتی. شێوە یاخود فۆرم لە ڕووی گرنگیی پێگەیەکی پلە دووی

وەرگرت لای هونەرمەند. شتێك لە ئازاردان و نەبوونی هاوڕێکی ناوەکی و هەستکردن بە قورسایی لە کارەکانی هونەرمەندە تەعبیرییەکاندا دەرکەوت کە لە هەوڵەکانی کۆتایی ژیانی "ڤان کوخ" سودمەند ببوون یاخود لە "ئەدوارد مۆنش" (Edward Munch) (١٨٦٣-١٩٤٣). ئەو هونەرمەندانە ئاڕاستەیان بەرەو ڕاستگۆیی بینین نەگرت. بەڵام جەختیان لەسەر هەڵچوونێکی تراژیدیانە دەکرد، لە سیماکانی ئەم هونەرە: گۆڕینی ئاڕاستەکانی هێڵی پەرەموچ بۆ وەشاندنی لە پرو پەیت کراوە، ڕەنگە بەهێزەکان لە پێکهاتەکانی نێو فوفیزمەکان، گەیشتن بە سادەیی منالی، شێواندنێکی دیار کۆمەڵی پرد (دی بروك Die Bruke) کە ساڵی ١٩٠٥ دامەزراوە لە درسدن دیارترین نمونەی ڕێبازی تەعبیریەتن، لە نێوان ئەم کۆمەڵەشدا "ئیریك هیکل" (Erick Heckel) و "ئارنست لودڤیج" (Ernst Ludvig) و "ماکس بشتین" (Max Pechstein).

لە کەسایەتییە دیارەکانی نێو تەعبیرییە ئەڵمانییەکان "ئۆسکار کۆکۆشکا"ی نەمساوی و (Oskar Kokoschka) هونەرە ناجێگیرەکەیەتی، توندوتیژ لە ڕەنگەکانیدا، ئاڵۆز لە کۆمپۆزشندا، هەرچۆن خاوەن بەهایەکی تراژیدی کاریگەرە. ئەو چوارچێوە ئاوەزییەی کە کاری تەعبیری بە گشتی پێوەی دیارە، وای لێ دەکات وەك لە ناوچوو بەدەرکەوێت لەو ماوەیەدا کە "هتلر" فەرمانڕەوایی دەکرد. چۆن خاوەنی ئەم کارانە بەر

هەموو جۆرە ئازاردان و لەناوبردنێك دەکەوتن، ئەمەش ئەوەمان پیشان دەدات تا چ ڕادەیەك ئەم کارانە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ گوزارشتیان لە ڕەخنە کۆمەڵایەتی و ڕامیاری کردوەو تا چ ڕادەیەکیش فەرمانڕەوا نازیەکانی ئەڵمانیا بە توندی ئەم جۆرە کارانەیان ڕەت کردۆتەوە. ئەوەش یەکێکە لە لایەنەکانی خواستی تەعبیریەت کە مرۆڤ تیایدا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت، بەڵام ڕۆڵێکی تراژیدی.



ئەدوارد مۆنش، خەونیشەوێکی هاوین،١٨٩٣، رۆنتی لەسەر
کانڤاس،٨٧×١٠٨سم



ئۆسکار کۆکۆشکا، دووخۆشەویستی روت، ١٩١٢،رۆنی لەسەر
کانڤاس، ١٦٣×٩٧سم

## -لە تەعبیریەتەوە بۆ ئەبستراکت:

لایەنێکی تر هەیە کەمتر توندی لە خۆ دەگرێت لە لایەنی هەڵچونەوەو پەیوەستە بە شیعر و مۆسیقاوە تا رادەیەك، "کاندنسکی" و لایەنگرەکانی نمونەی ئەم لایەنەن کە سەر بە کۆمەڵێکن بە ناوی سواری شین "دربلوریتر" (Der Blaue Reiter) ساڵی ١٩١١ لە میونخ دامەزراوە، هەموو ئەندامانی ئەم کۆمەڵە ئەزمونگەری نەبوون لە رێبازیاندا، بەڵام پەیوەندییەکی توندوتۆڵ بە هاوسەردەمە پێشکەوتن خوازە فەرەنسییەکانییەوەی بەستبوونەوە وەك "ماتیس" و فۆفیزمەکان و "جۆرج رووە" (کە دادەنرێت بە نیگارکێشێکی فەرەنسی ئازادو تەعبیرییەکی پەیت) و پیکاسۆ و براك" و کیوبیزمەکان لە نێوانیاندا "رۆبرت دیلانۆی" (Robert Delauany) ١٨٨٥-١٩٤١ کە تابلۆی (بورجی ئیفل)ەکەی شاری بازل مۆزەی (کۆنست) دادەنرێت بە نمونەیەکی جوان لە تەرزی کارکردن و زیاتر شاعرییە لە هاورێیانی باوەڕی کیوبیزمی، لەسەر ئەوەشەوە بە زیاترین هونەرمەندیٚ ناوزەد دەکرێت کە پەیوەست بێت بە تەعبیریەکانەوە لە میونخ، بەڵام "فرانزمارك" (Franz Marc) (١٨٨٠-١٩١٦) کە توانی بە هاوکاری "کاندنسکی" پرۆگرامی تەعبیریەت ببوژێنێتەوە، بێ هاوتا بوو لە تەرزی کەسێتیدا هەوڵی

ئـەوەی نـەداوە شـتە دیـارو سروشـتییەکان لـە کارەکــانیدا بشارێتەوە کـە بـە گیانـەوەران و دیمـەنی سروشـتی پــڕی کردونەتەوە، بەڵام گرنگی سەرەکی داوەتە ئەو هەستانەی دیمەنــەکان دەیجولێنـــن، هــەوڵی داوە جیــهانی نـــاوەوە وەرگـێڕێ بـۆ هەسـتەکان بـە بـەکارهێنانی ڕێککەوتنــە ڕەنگییەکان و هێڵە ڕیتمییەکان بە شـێوەیەکی ڕێـك وەك ئەوەی لە مۆسیقادا ڕوودەدات. ئەوەی جێی سەرنجە چۆن ئامانجەکان و هۆکارەکانی هونەرە جۆراوجۆرەکان گۆڕاون، تەنانەت نیگارکێشەکان دەستیان کرد بە گەڕان لـە شـوێن کاریگـەری مۆسـیقا. لـە کـاتێکدا ئاوازدانــەرەکان هــەوڵی بەخشــینی وێنەیــەکی دەنگییــان دەدا، شــاعیرەکانیش هەندێ جار دوور دەکەوتنەوە لە مانا زەینـی و ئەدەبییـە پەتیــەکان و وێنــە شــێوەکارییەکانیان لا پەســەند بــوو یـاخود تەنـها جوانـی دەنگێکـی ڕێکخـراو. دەکرێـت ئەمــە ئەوەمان بۆ دەرخات چۆن هەموو هونـەرەکانی ماوەیـەکی زەمەنی هەوڵی دەرخستنی بەها هاوبەشەکان دەدەن.

**-کاندنسکی:**

"کاندنسکی" کە بە گەورەترین هزرمەندی هەستیاری سەردەمی خۆی دادەنرێت، وا دەزانێت میتۆدی گشتی شێوە و ڕەنگ دەکرێت وەك ڕێسای مۆسیقا بیری لیٚ بکرێتەوە، بە پێی بۆچونی "کاندنسکی" وێنە دەبێت بەرهەمی سروشتی ئەندێشە بێت و سەراپا ئازاد بێت لە هەموو جۆرە واقعیەتێکی دەرەکی و بە هەمەکی ئاڕاستەکراوی هەستەکان بێت. ئەم ئاڕاستە ئالۆزو نالۆژیکیە بەرەو هونەر، ئەم هەولانە بۆ وێنەکردنی جیهانی نەبینراو لە هێماداو لە شێوە ڕەنگی و هێڵییەکاندا، "کاندنسکی" گەیاندە ئەفراندنی چەند تابلۆو کۆمپۆزشنێك دامەزراو لەسەر ڕێکەوت. تەنانەت گۆڕینی کیوبیزمەکانی بۆ ڕەهەندەکانی سێهەم نەگرتەخۆ، یاخود هێشتنەوەی توخمە سەرەتاییە زانراو و ناسراوەکان. دواتر نیگارکێشانی ئەبستراکتی بە شێوە پەتیەکەی لە سەرسامبونیەوە بەم ڕێڕەوە سەرچاوەی گرت.



رۆبرت دیلانۆی، کچێکی روت دەخوێنێتەوە، ١٩١٥،رۆنی لەسەر
کانڤاس ،٥٤×٤٢ ئینج



فرانز مارك، گورگەکان، ١٩١٣، رۆنی لەسەر کانڤاس ،٢٧ × ٥٥ ئینج.

**-کلی:**

هەر دوای ماوەیەك هونەرمەندی سویسری "پول کلی" (Paul Klee) (١٨٧٩-١٩٤٠) بەدەرکەوت کە خۆی بە بیروڕاکانی "کاندنسکی"یەوە بەستبۆوە. بەڵام "کلی" لە تابلۆکانیدا پابەندییەکی هەستیاری دەرخستوە بە جیهانی واقع و ئەندێشەوە. هەرچی چەندێ "پۆل کلی" کارایی بەم چوارچێوەیە دابێت، هێندە ڕێی بۆ بەرهەڤ بوونی نەست خۆشکردوەو لە هەوڵی ئەوەدا بوە بە ڕەمەکی نیگار بکێشێ وەك چۆن منداڵ دەیکات و لە زۆربەی کاتەکاندا دەگات بە ئەنجامی ساویلکانە هاوشێوەی بەرهەمی منداڵ، بەڵام لە دووتوێیدا بە ئاشکرایی بەهای پێگەیشتوو بۆ هێڵ و ڕەنگ لەخۆ دەگرێ، بە پێی ئاوەزی ئەندێشەیی "کلی" هەموو شێوەو ڕووبەرێك بێ ئامانج دادەنرێت، بەڵام زۆرجار سروشتی کەسێك یا شێوەیەك یا ڕوویەك یا دیمەنێکی سروشتی یاخود باخچەیەك دەدات، بە شێوەیەکی پێکەنیناوی ئاماژە بەوە دەدات لە ناونیشانی تابلۆکانیدا.



پۆل کلی، دۆن جیوڤانی باڤاری، ١٩١٩، بۆیەی ئاوی و مەرەکەب لەسەر کاغەز، ٨٧ × ٨٧ ئینچ.



ڤاسیلی کاندنسکی، نیگارکێشان بە خانوو، ١٩٠٩، ٩٨ × ١٣٣ سم.

-مۆندریان:

"پیت مۆندریان"ی هۆڵەندی (Piet Mondrian) (١٨٧٤-١٩٤٤) کە ساڵانێکی زۆر لە پاریس ژیاو دواتر ڕۆژانی دوایی تەمەنی چوە نیویۆرك و ناوبانگێکی گەورەی لە گۆڕەپانی هونەری نابابەتیدا پەیداکرد، توانی لە کۆمپۆزشنەکانیدا خۆی بە ڕێسایەکی (ئەسبرطی) توندوتۆڵ شەتەك بدات پێکهاتوو لە ڕاستەو لاکێشەو ڕوە خاوەن گۆشە وەستاوەکان، کە بە ڕەنگی سەرەتایی پڕی دەکردنەوە. لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێشێ کە پێویستە وەڵام بدرێتەوە ئەویش ئەوەیە: لە پشت شێوەکانی مۆندریانەوە چ بیرۆکەیەك هەیە؟ کە نیگارکێشانی ئەبستراکتی هەوڵی گوزارشت کردنی بە مەبەست دەدات لە وێنە ڕێکخراوەکانیدا، کە خاوەن ڕەنگ و گۆشە وەستاوەکانە، خۆلادان و گێل کردنمان و دانپیانەنانمان بە هەموو دەوڵەمەندییەکی هەمەجۆر کە بە چاوی خۆمان دەیبینین لە ژیانماندا، یان بە پەرچەکردارێك دادەنرێت دژ بە مادیەتی سەردەم، یاخود بە دواداچونێکی ڕەخنەگرانەی ئەم مادیەتەیە، ئەم ڕەخنەیەش مانای ئەوەی مرۆڤ تەنها مادە نیە بەڵکو ڕۆحە پێش هەموو شتێك.



پیت مۆندریان، کۆمپۆزشن ژمارە هەشت، ١٩٣٩، ڕۆنی لەسەر
کانڤاس، ٧٤ × ٦٧ سم.



ئەمبرتۆ بۆتشیۆنی، شەقامەکە لەنێو ماڵەکەدا ،ڕۆنی لەسەر
کانڤاس، ١٠٠ — ١٠٦ سم.

ڕێبازی ئەم هونەرمەندە لە سێ بەشی نیگارکێشاندا دەبینین کە بۆ بابەتێکی دروست کردوە، لە وێنەی یەکەمدا هەموو گرنگی پێدانی لە دەرخستنی دیاردەی دەرەکیدا بەکارهێناوە، دواتر دەبینین کاریگەری ڕێبازی کیوبیزمی لە سەرە، شێوەکان و ڕەنگەکانی ڕێکخستوە بە شێوەیەك بڕوای وایە ئەوە بنەمایەکە کە دەبێت تابلۆ لەسەری بڕوات.

## -بزاڤی فیوچەریزم (موستەقبەلیەت):

فیوچەریزم لە ئیتالیاوەو بە ماوەیەکی کەم بەر لە جەنگی جیهانی یەکەم دەستی پێکرد. لە سەرەتایدا سەرسام بوو بە ڕێبازی کیوبیزمی پاریسی. ئەم بزاڤە لە دووتوێیدا ئاماژەی تێکچوونێکی ڕۆحی و شۆڕشێك دژی شارستانییەتی سەدەی بیستەمی بڕست لێ بڕاو هەڵدەگرێت. فیوچەریزمەکان لە ژێر سەرکردایەتی مارتینێتی شاعیردا (Martinetti) خواستی پابەندبوونیان بە هیچ ڕێسایەکەوە نەبوو. بە توند دژ بە هەموو ئاراستەیەکی ڕابوردوو هەڵگەڕانەوە، بە پێی ئەم ڕێڕەوە وێرانکەرە، پێویستە ڕێسای ئەفرێنراوی پیادەو پێودانگە مێژوییەکان و مۆزەکان و کتێبخانەکان و ئاسەوارەکان لەناوببرێن. ئەمانە سەراپا دەبێت لاببرێن و فیوچەریزمەکان جەختیان لە بەهای خێرایی و هێزو ئامێرەکان و جەنگ کردەوە، لەبەرئەوەی شارستانیەتی

نوێ لەمەدا بنیات نانی خۆی دەبینێتەوە. بەڵام لە لایەنی ئامانجی ئیستاتیکی فیوچەریزمەکانەوە ئاراستەیان تەعبیریانە بوو: وێنەی گەرم خۆشەویستی بۆ جوڵەو دینامیکیەت (دینامیکیەت لە وتە خۆشەویستەکان بوو لایان) وێنەیان کردوە بۆ نمونە بە کەسێکی جوڵاو، جوڵە جیاوازەکانیان گرتوە یەك لەدوایەك و خستویانەتە سەر یەکتر وەك چۆن لە بەدوایەکتر هاتنیدا دەردەکەوێت.

لەم ئاراستەیەدا ئەمبرتۆبۆتشیۆنی (Imberto Boccioni) ١٨٨٢-١٩١٦ فیوچەری توانی هەندێ کاری هونەری بەدی بێنێت کە هێزو توندی لە خۆ گرتبێ. بەڵام فیوچەریزم زۆر نەژیا چون لایەنە سەربازییەکەی وای لێکرد فاشیەکان بەلای خۆیاندا ببەن، ڕێبازگەلێکی تر شوێنیان گرتەوە کە هەندێ پەیوەستی بە بیرۆکەی یەکەمییەوە مابۆوە.

## -تشیریکۆ:

کارەکـانی "جیۆرجیـۆ دی تشـیریکۆ" (Giorgio de Chirico) لـە ئاراسـتە ئیتالییــە دیارەکانــە. لـەم کارانــەدا کەسانێك دەبینین دیمەنێکی ئامێرییان یەکەی ئەندازەیی و چەندان بەش لە بیناو خانورەبـەرەو هـەندێك توخمـی دژ بەیەك کە یەك لە پاڵ ئەوی تردا دانراون وەك ئەوەی لـە خــەوندا بێـت، ئەمــەش بــە هــەڵچوونێکی قــورس و کاریگەرییـەك بـە گــران بەرگــەی بیگرێـت. ئـەم کارانــە هەندێ شت دەڵێـن کـە نیگاری مۆدێـرن جیادەکاتـەوە لـە بـێ هاوتــاییدا، لــە ڕووی مێژووییشــەوە خــاڵی پێکـــەوە گرێدانی بە یەك گەیشتنی هەردوو ڕێبازی فیوچەریزم و ســوریالیزمە. هەڵەیــە گــەر وەك کــارێکی ســوریالی لێـــی بدوێـــین، وەهـــاش دەرناکـــەوێت کـــە ئەندێشـــەکانی "تشـیریکۆ" لـە عــەقڵی نــاوەوەی ســەوز بووبێــت، بــەڵام ڕاســتتر وایــە بڵێــین "تشــیریکۆ" هــەوڵی داوە ئەفســونی جیهانی دەوروبەری و نادیارییەکەی دەربخات.



جیۆرجیۆدی تشیریکۆ، ئاریادن، ١٩١٣، مەرەکەب و زەیت لەسەر کانڤاس، ١٣٥ × ١٨٠ سم.



جیمس ئانسۆر، هاتنە ژورەوەی مەسیح بۆ برۆسێلز، ١٨٨٩، ڕۆنی لەسەر کانڤاس، ٩٩ × ١٦٩ ئینج.

**-سوریالیزم:**

هەرچی سوریالیزمە شێوەیەکی دیاریکراوی وەرنەگرت تا ساڵی (١٩٣٠)، بەڵام خاوەن ڕەگ و ڕیشە بوو لە ڕێبازی دادا (Dadaism)کاندا ساڵی (١٩١٧) کە بەتاڵی جەنگ ڕەنگ کرابوو و گاڵتەی بە هەموو هەوڵێك جیدی و ئایدۆلۆژی دەهات، لە میانی ئەوانەشدا ئەو بیرۆکانەی دەرباری (هونەر) بوون، تەنها لە دابڕاندنی توانا لە بیرکردنەوەدا جیدی بوون لە پرۆسێسی گوزارشت کردن لە نیگارکێشانداو نووسین و هەتا لە ڕێکخستنی هەرەمەکی لە توخم و دیاردە جۆراوجۆرەکاندا. جیهانی "تشیریکۆی" میتافیزیکی لانکەیەکی سوریالیزم بوو هەرچۆن بوە لانکەیەکیش بۆ کارەکانی هونەرمەندی بەلجیکی "جیمس ئانسور" (James Ensor) (١٨٦١-١٩٤٩) کە بە سروشتی خۆی لایەنگری بیری ئەندێشەیی گاڵتەجاڕی بوو، و توانی کاریگەری تەعبیرییەکان تێپەڕێنێت و بە ڕێگەیەکی تایبەت بە خۆی بەکاری بێنێ و سودی لێ وەرگرێت. وەك ئەو حاڵەتەی لە تابلۆی (مەسیح دێتە بروسێلز) و لەو دیمەنە ترسناکانەیدا کە پڕن لە بوکەڵەو هەیکەلی بزۆك و کەسایەتی گاڵتەجاڕی نەناسراو "ئانسۆر" بە پیر خەونێ بێزارکەری سوریالییەکانەوە چوو، ئەو زۆر جار بەهایەکی وێنەیی ڕاستەقینەی لە

کارەکـانیدا پیشـان دەدا، بـەڵام بـە ڕەنگـی ناسـكو نائاسـایی، لێـوان لێـو بەرێکـەوتنێکی دەوڵەمـەندی جـوان. ئەمـە لـە ساتێکدا کـاری سـریالیەکان خۆیـان لـە ئـەدەب نزیکتر بوو وەك لـە نیگارکێشانێکی ڕاسـتەقینە. جیهانی ئەندێشەیان لەسەر بیرۆکەی نەست دامەزرابوو پابەند بە میتۆدەکانی "فرۆیدەوە". دەکرێت هاوشـانی خەونـەکانی ئەوان بە بەرجەستەکراوی لە نیگارکێشاندا بـە گوزارشـت کردنەکانی "جیرۆم بوش" (Jerome Boch)ەوە ببینـین لـە کۆتاییەکانی سەدەی ناوەڕاستدا. لە یەکێ لـە تـابلۆ لێـوان لێوەکانیدا بـە تـرس کـە لـە شـێوەیەکی جۆڵەوانیدایـە، تـاوەری تیایـە کـە لەسـەر پێـی ژنانـە دەڕوات، و سـەری مـرۆڤ لـە قـەدی درەخـت ڕواوە و بونـەوەری ناسروشـتی دەموچاو کوێرەوە بـوو چـەندان هەیکەل کـە لـە پـەیژەو شـەڕواڵ پێـك هـاتوون، ئەمانـەن دانیشـتوانی تۆقێنـەری دیمەنەکـە. هونەرمـەند سـەراپا ئـەو وێنانـەی دوور نەخستۆتەوە لـە جیهانەکەی کـە ترسـناکن و پەیوەسـتن بـەو ورێنـەو گـرێ دەرونیانـەوە کـە لـە گـەڵیدان. نیگارکێشـانیش وەك لایـەنێکی سـوریالیەت هاوشـێوەی فیوچـەریزم ڕووی لـە باوەشـکردنی هـەموو ژیـانی مرۆڤایەتی و ئایدیۆلۆژییەکانی کرد، هـەرچۆن نووسـەری فەڕەنسی "ئەندریە بریتۆن" ڕوونـی کردۆتـەوە هـەوڵێك بـوە بـەرەو ڕزگـارکردنی مـرۆڤ لـە کۆیلەیـەتی، لـە ڕێـی ئازادکردنێکی ئاوەزییەوە، سوریالیەت لایەنێکی گوزارشتی

ئـەدەبی و شـــاعیری هەیـــە کـــە ڕووی لـــە نووســـینێکی ئۆتۆماتیکییـە نمونـەی چـالاکی عــەقڵی ناوەکییــە بــەبێ کۆنترۆڵ کردن. ڕێبازی سوریالیزم گرنگی بــە دۆزینــەوەی جۆرێـك لـە نــامۆیی دەدا لــە توخمــە سروشــتییەکانیداو ڕاکێشانی ســەرنج بـۆی. وەك وروژانـدنـی ئاگـا دەربـاری ڕەگـەکانی درەختێکـی نـەزانـراو، ئەمـەش شـتێکە شـایەنی نیگارکێشان و دەکرێت نوێنەرایەتی هونەر بکات.

ڕێبازی سوریالیزم لەلای هونەرمـەند "سـلڤادۆر دالی" (Salvador Dali) (١٩٠٣) ئامادەیی ڕەسەنایەتییەکی دی بـە خۆوە، ئەو لە ئوستادی سنعەتە، توانی بە شـێوەیەکی بـێ وێنــە دەریخـــات و کارەکـــانی هـــەلگری خەونـــەکان و باوەڕەکانیەتی دەرباری جیهان، هونەرەکەی ڕێچکەیـەکی ئەدەبیانـەی گرتبـوو زیـاتر وەك بینینکاری. دەشـێت بـــە ژیانەوەیـەکی ڕۆمانتیکیـەت دابـنرێت کـە لـە شـێوەیەکی نوێی ترسناکدا خۆی شاردبێتەوە.



جیرۆم بوش، مەسیح خاچی هەڵگرتووە، ١٤٨٠-١٤٩٠، تەختە، ٥٧ × ٣٢ سم.



سلڤادۆر دالی، فەزای حەوا، ١٩٧٢، ڕۆن لەسەر کانڤاس، ٥٨،٧ × ٧٦، ٣ سم.

## -شاگال:

هونەری "مارك شاگال" (Marc Chagall) خەسڵەتێکی جیاوازە، توخمێکی بینین کاری و جوانی پەیت لە خۆ دەگرێ. لەگەڵ ئەوەشدا نەست ڕۆڵی خۆی دەگێڕێت. ئەم جولەکە ڕوسییە هەستیارە لە پێش جەنگی جیهانی یەکەمەوە خەریکی گرنگی دان بوە بە جیهانی شارراوەی پشت هەست، کە لە نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا، تەوەری داهێنان بوە لەلای سوریالیزمەکان. شاگال ساڵی ١٩١٠ گەیشتە پاریس لە ساتێکدا هەردوو ڕێبازی کیوبیزم و فوفیزم لە چڵەپۆپەیاندا بوون، بەڵام ئەو وێنەیەکی غەمباری لەگەڵ خۆدا هەڵگرتبوو تا دووری لە وڵاتەکەی پێ بلاوێنێتەوە.

بە تایبەت شوێنی لە دایك بونەکەی ویتبسك (Witabsk) ئەو ناوچەیەی پڕی بوو لە بیناسازی جیاواز و ژیانە لادێییەکەی و هونەرە میللییە ڕازاوە بە ڕەنگەکانی، و پیاوە پیرەکانی بە ڕیشی درێژەوە و کەنیسە بچووکە خاوەن گومەزە بێزەنتییەکانی کە خاوەن مۆرکێکی حەلەزونی بوو. "شاگال" توانی هەموو ئەمانە لەگەڵ یەکتردا پێکەوە گرێ بدات و بە شێوەیەکی کارامە و بە ڕێگەیەك چیرۆکێکی ئەمینمان بۆ دەگێڕێتەوە. خاوەن شێوازێکی ساویلکانەیەو سیفەتێکی نالۆژیکیانەی

هەیـە وەك ئـەوەی لـە خەونـدایـە یـاخود لـە چیرۆكـە خورافیەكاندا. جیهانی ئەو پڕە لە ئەندێشـە، لێوان لێـوە بـە ئەگـەرەكان لـە جیـهانی منـاڵان دەچێـت كـە تیشـكی ڕۆحێكـی ڕاسـتگۆیانە دەداتـەوە. هەرچـەندە "شـاگال" واقعیەتی بە ناواقعیەت تێكەڵ كرد، بـەڵام لـە كارەكانیدا ئەندێشەی توندو وێرانكەری پیشان نـەداین یـاخود هێما سێكسـییەكان و ئـەو ئەگـەرە تاكڕەوییانـەی "دالی" و كەسانی تـر لـە سوریالییەكان پیاهـەڵیان دابـوو. ڕەنگـە كراوەكـانی و تـەرزە شـادمانەكەی كـە كاریگـەری هیـچ كەسـێكی تیـا نـەبوو، هـەندێ جـار داهێنانـەكانی بەختەوەرییـەكیان لەگـەڵ خـۆ هـەلگرتبوو جۆرێـك لـە وڕێنەی سەر بە هونەرە میللییەكانی كردبوە ناوەڕۆك.

## -بزاڤی مۆدێرنیتی له ئینگلتره:

لەو شاتانەی جێی سەرسوڕمانە ئینگلترایەك كە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا لە هەوڵی پارمەتی سەرهەڵدانی هونەری مۆردێرندا بوو، لە ڕێی هونەرمەندانی وەك "كۆنستابل" (Constable) و تێرنەر (Turner) و بۆننجتن (Bonington)"، بە دوور مایەوە لە گەشەی ئەم هونەرە لە ئەوروپا، ئینتباعیەت لە ئینگلترە لە ساڵی ١٨٩٠ دواتر مەسەلەیەكی جەدەلی بوو بیرورا لە سەری دەست نیشان كراو نەبوو، بەلام ئەو ساڵانە لە مێژ بوو پاریس ئینتباعیەتی بەجێ هێشتبوو. لە ساڵی ١٩١٠شدا پیشانگەی ئینتباعیی كە لە لەندەن كرایەوە شتێك بوو سەرسوڕهێنەر. ئەم پێشەنگایە جوڵەی خستە نەوەیەكەوە كە لە ئەندێشەكانی "بیرن جۆنز" (Burne Jones)دا گەشەی كرد و بەرجەستە بوو، تا ئێستاش ئەو هونەرمەندێكی وەك "هویسلر" بە كەسایەتییەكی شۆڕشگێڕی هونەریی دادەنێت. ئەم پێشانگەیە ڕێی بۆ ئاڕۆژانێكی پێویست كردەوە لە سەرەتای سەدەدا نیگاركێشانی بریتانی شێوەیەكی نوێو هەرچی بە پێزتری بەخۆوە دی، هەروەها سودی لە پەیوەندییەكانی بە ئەوروپاوە وەرگرت.



مارك شاگال، پاریس لە پە نجەرەوە، ١٩١٣، رۆنی لەسەر كانڤاس،
٥٣ × ٥٥ ئینچ.



ئۆگستس جۆن، جۆزیف ئی، ١٩٢١، رۆنی لەسەر كانڤاس،
١٢٤ × ١٠٢ سم.

لە ڕاستیدا لە ئینگلترە پێش ساڵی ۱۹۱۰ دوو هونەرمەندی خاوەن پێگە لە نێوان هونەرمەندە کلتییەکاندا دەرکەوتن، یەکەمیان "فرانك برانجون" (Frank Brangwyn)ە کە بە کارە نەخشاندنەکانی (زەخرەفی) لە سەراپای جیهاندا ناسرا. دووەمیشیان "ئۆگستس جۆن" (Augustus John)ە هونەرمەندێکی دیار و بە توانایەو پابەندی ڕێسا کلاسیکییەکانە، بەڵام وەك دەردەکەوێت لە ڕێی سروشتی خۆیەوە شتێکی خستۆتە سەر زیندویەتی ڕێبازی ئینتباعیەت و بەرفراوانییەکەی. "ولسن ستێر" (Wilson Stear)یش (۱۸٦۰-۱۹٤۲) بە یەکێك لە نوێنەرانی ڕێبازی ئینتباعیەت دادەنرێت کە خاوەن کاریگەری و گرنگی خۆیەتی لە دەرەوەی فەرەنسا. دوای توێژینەوەکردنی لە پاریس و سەرسام بوونی بە کارەکانی "سیزان"، توانی بەرەو بە ڕێسا هونەرییە بریتانییەکان بدات کە هەرکام لە "کونستابل و جینزابرا" جێیان هێشتبوو، بەڵام بە شێوازی تایبەتی خۆی.

لەو هونەرمەندانەش کە کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر نیگارکێشە لاوەکان هەبوو هونەرمەند "ولتر سیکرت" (Walter Sickert) بوو (۱۸٦۰-۱۹٤۲) کە سارسامییەکی زۆری هەبوو بە "دێگا"ـ بەبێ فرامۆش کردنی سود وەرگرتن لە ڕەخنەی دوا پێشکەوتنەکانی نیگارکێشانی فەرەنسی. هەرچۆن توانی هونەرمەندانێکی زۆر هان بدات گوزارشت لە خودی خۆیان بکەن، بە شێوازێکی تایبەت بە خۆیان و

بـە لێپرسـراوی پێکـهاتنی کۆمـەڵی کـامیدن دادەنرێـت (Cameden Town Group) کە بـەهای خـۆی هـەبوو لـە وەرگێڕانی بیروباوەڕەکانی "سیزان و گوگان و ڤان کوخ"، وەرگێڕانێکی ناوخۆییانـە. لـەو سـەردەمەوە قوتابخانـەی ئینگلـیزی پێگەیشـتوو لـە هـەموو ڕێچکەیـەکی نوێـدا تـا هونـەری ئـەم چل ساڵەی دوایـی ڕۆڵـی خـۆی دەبینێـت. بەڵام "ویندهام لویس (Wyndham Lewis) و نیڤنسن (C. R. W. Nevinson) بـە ماوەیـەکی کـورت پێـش جـەنگی جیهانی یەکەم پێکەوە بزاڤێکیان بـەدی هێنـا، بـە نـاوی دینامیکیەتـــەوە (Vorticism) کـــە وەرگـــێڕانێکی ئینگلیزیانــەی کیوبــیزم و فیوچــەریزم بــوو. "مـــاتیو سمیــث" (Mathew Smith) توانـــی وەك جێگرێکـــی "ماتیس" و بزاڤی فوفیزم و نیگارکێشێك بەهرەمەند لـە ڕەنگدا خۆی بە خەڵکی بناسێنێت. بـەڵام هونـەری "پـۆل ناش" لێکدانێك بوو لە نێوان بیروبۆچوونـەکانی کیوبیزم و تەعبیریـەتدا، بـە تـەرزێکی شـاعیرانە بـە شـاعیریەت و مۆرکێکی ئینگلیزیانەی خۆی، کاریگەری بە ڕەنگە سـەرنج ڕاکێشەکان دەدات بەڵام بێهاوتایانە.

هونەرمـەندە بەریتانییـە هاوچەرخـەکان توانیویانـە ئیعترافێکی نێودەوڵەتی بۆ خۆیان بەدەست بهێنن، لەسەر ئەو بنەمایەی گیانی هونـەری سـەردەمیان وەرگێڕاوە لـە نێوانیـاندا "بـن نیکلسـۆن" (Ben Nicko lsen)ە وەك هونەرمـەندێکی ئـەزموونی، توانـی چێـژو جوانکارییـەك

بداتـه ڕێکخسـتنی هێـڵ و ڕەنـگ بـە هێندایـی ڕێچکـە واقعییـــەکان دەیگرێتـــەخۆ. "گراهـــام ســـوزەرلاند" (Graham Sutherland)یش بە سەرکەوتنی لە دۆزینـەوەی بەرامبەریـەك بـۆ واقعیـەت لـە هەرێنایـەکی هێماگـەری توندو دیاریکراودا بەدەرکەوت، ئەو تابلۆیەی دەربارەی لە خاچ دانی عیسایە لە کەنیسەی سانت ماتیورە لـە نـۆرث هامبتن (١٩٤٦)، بیرۆکەیـەکی ئـەو لـەخۆ دەگـرێ کـە بـە شێوە وێرانە خاوەن گۆشـەکانەو سـوچە تیژەکانی دەمـان بزوێنێ.



فرانك برا نجۆن، ئیمپۆراتۆریەتی بریتانی، لەسەر تەختە،
٣٠ -١٩٢٥.



ولسن ستێر، کچێك لەسەرقەنەفە، ١٨٩١، رۆنی لەسەرکانڤاس،
٥٦ × ٦١ سم.

## -سروشتی هونەری هاوچەرخ:

هونـەری ئـەم ســەردەمە وێنەیــەکی تێکـەڵ و دووره دەستی لەخۆ گرتـوە، توێژینـەوە تیـایدا هـەر بەردەوامـە، بەناو خۆیدا هـەڵکوڕماوە. لەمـەدا وەك سروشـتی مرۆڤـی نوێیە کە زۆری لە نەهامەتی چەشتوە و چارەسەرێکی بە دەست نەکەوتوە بـۆ کێشـە زیندوەکانی. لـێرەدا دەکـرێ بپرســین بــەرەو چ دوارۆژێـك ئاراســتەی هونەرەکــەمان بکــەین؟ ئــەوەی ئاشــکرایە گەیشــتوینەتە قۆنــاغێکی سـەغڵەتی پەرپینــەوە. هـەندێ گلـەیی و گـازندەی ئـەوە دەکەن سـەردەمەکەمان تـەرزێکی نییـە، ئـەوەشمان ڕەت کردەوە هونەر ڕەق هەڵبێ و ڕابوەستێ. هەوڵێکی زۆرمان لـە بـواری ئـەزموون گـەراییدا دا، ئــەم تێکۆشــانەشمان پەیوەستە بە سروشتی مەدەنیەتی نوێوە، ئەمرۆ کەسێك نییـە لـە لایـەکی تـرەوە وەك "ڕامـبرانت (Rembrandt) یـاخود تیتیـان (Titian" نیگـار بکێشـێ، بـەڵام لـەوەوپێش هــەرگیز هەســتکردن بــەم شــێوە زینــدوەی ئێســتای نەگواستراوەتەوە نێوکاری هونەری و بەرجەستە نەکراوە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێمە هونەرمەندەکانمان ڕیزبەند کرد لـە کۆمەڵـەکاندا و لـە بزاڤــە هونەرییــە جیاجیاکــاندا وەسفمان کردن (وەك زۆرێك لە حیزبەکان)، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت بوونی تاك گەرایی هەمەجۆرو بێهاوتای

لە ژمارە نەهاتوە. چ شارەزایی و بەڵەدبوونێکە ئەوەی هەستی پێدەکەین و لێوەی فێردەبین، لە هەر مۆزەیەك هونەری مۆدێرن لە خۆ بگرێ! تابلۆیەك کاراو ڕۆحانی، سەرباری لاکێشەییەکەی و زۆر لە خۆکردن تیایدا "مۆدیلیانی" ئیتالی دەی ئەفرێنێ، دەکرێت لە پاڵ تابلۆیەکی زەقی "ڤان کوخی" هۆڵندیدا دابنرێت. تابلۆیەکی تر لە دوتوێیدا غەمی کرێکارانی ئەڵمانی بێ هیوا لە سەدەی بیستەمدا هەڵدەگرێ لە دەستکردی "ماکس بکمان" "Max Beckman"ە، دەشێت لە تەنیشت مریەمی توند هەڵچوو سەرنج ڕاکێشی دروستکراوی پەرەموچەکەی "جۆرج ڕوە" دابنرێت. دیمەنێکی سروشتی چاك پڕکراوە بە تواناو توخمە سەرەتاییەکان کە ئینتباعی بەلچیکی "پێرمك" (Permeke) بەرجەستەی کردوە، هاوشان دانراوە لەگەڵ دیمەنێکی سروشتی ئەرستۆکراتی بێهاوتا کە خۆشییەکی لاتینی لە ڕەنگەکان و سیماکاندا هەلگرتوە، دەستکردی "دینویە دی سیجونزاکە" (Dunuyer de Sogonzac). ئەندێشەی هێڵێکی شاراوە "پۆل کلی" دایناوە، دەکرێت لە پاڵ خەونێکی سوریالی "خوان میرۆ" وە ببینین. ئەندێشەیەکی توندوتیژی "پیکاسۆ" دەبینین لە سێبەری دیمەنێکی جیاواز لە شادی، لێوان لێو لە کەشێکی ڕابواردن و خۆشی، ناسکی و هەڵۆدایی لە بەرجەستە کراوی "ڕائول دوڤی"یە. ئەمانە گشت نمونەی هونەرن لەم سەردەمەدا.

لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا هونەرمەندی فەڕەنسی دەتوانێت بانگەشە بکات و بڵێت: "ڕێبازەکان لە هونەردا نین بەڵکو تەنها هونەرمەند هەیە".



**ولتر سیکرت، چێشتخانەی فەرەنسی، ١٩١٠، ڕۆنی لەسەر کانڤاس، ٩٧ × ٤٢ شم.**



**ویندهام لویس، چواردەوری بەرشلۆنە، ١٩٣٤.**

## -کۆتـایی:

لەگەڵ ئەوەشدا دەزوییەك لە ئارامی و نیشتەجێی لەو ڕێبازانـەدا هەیـە کـە هونــەری مۆدێرنــیزم پیـا گــوزەری کـــردوە. ئـــەوە تەنـــها پێچەوانەکردنـــەوەی میزاجـــە جیاوازەکانی سەردەمەکەمان نییە، بەڵکو پەیوەندیشی بە بیناسازی نوێ و هونەرەکانی هەرێنا (فنـون التصميـم) و گشـت ئاراســتەکانی ڕەنگــی داوتــەوە لــە شــیعری نــوێو مۆسیقای هاوچەرخدا دووبارە بۆتەوە. بە هیچ ولاتێکەوە دەستنیشان نـەکراوە، بـەڵکو هۆکارێك بـوە بـۆ گوزارشـت کردن لە هەموو جیهانێکی ئـازاددا. نـەوەکانمان دەتوانـن ئەم هونەرە جیهانییە پابەندی جۆرێك لە دڵنیایی بکەن، هەرچۆن ئێمە هونەری غوتی یاخود هونەری ڕێنیسانس بە جۆرێك لە ڕوونی مێژوییەوە دەبەستینەوە.

تـا چ ڕادەیـەك نـەوەی داهاتوو دەتوانـن لـە دووتوێــی ئەم هونەرەدا کارهایەکی نەمر بدۆزنەوە، خـاوەن بـەهای هەمیشەیی کە بەو کـارە نەمرانـەی لـە ڕابـردودا بەرهـەم هێنراون بەراورد بکرێت؟ ناتوانین پێشبینی ئەوە بکەین! ناشتوانین پێشبینی ئـەو ئاڕاســتەو ڕێــڕەوە بکـەین کـە پەرەسەندی هونەریی ئەمڕۆ بەرەو ڕویمان دەبـات. بـەڵام ئاڕاستەی هونـەری هاوچـەرخ هێشــتا هــەر درامــاتیکی و سـەرنج ڕاکێــش و سەرکێشـە، لەمەشـدا دەق لـە خـودی سەدەی بیستەم دەچێت.



نیڤنسن، پشیلەیەك، ١٩٢١، ئەكواتنت و ئیچینگ، ٤٠ × ٢٥ سم.



ماثیوسمث، كچێك لە بلوزێكی گونجاودا، ١٩٤١، ڕۆنی، ٩٣ × ٦٠ سم.

## پەراوێز:

١-ئـەم ناولێنانـە دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو هـاوارەی ڕەخنــەگر لویــس ڤۆکســیل کــە وتــی: دۆنــاتێللۆ لــە نێــوان دڕندەکــاندا (دۆناتیللو بین الوحوش). وەختـێ چـاوی کـەوت بـە پەیکـەری منــاڵێك (کــە پەیکەرســاز مــارك لەســەر شــێوازی دۆنـــاتێللۆ دروسـتی کردبـوو) بـە ڕێکـەوت کـەوتبوە نێوەنـدی کارەکـانی پیشانگەی یەکەمی ماتیس و هاوڕێکانی ساڵی ١٩٠٣ لـە ساڵۆنی پایزەی پاریسی. (وەرگێڕ).

٢- لێرەدا بیروڕای دیجینەر جیاوازە لەگەڵ هربرت رید چۆن هربرت رید وەختێ دەرباری ڕۆڵی ئیکلاکتیزم دەدوێ لە میانی مۆدێرنـیزم دا و سـەرچاوەکانی بـۆ دەستنیشـان دەکـات هیــچ گرنگییــەك بــە هونــەری فیرعەونیومســیۆپۆتامیا نـــادات. (وەرگێڕ).

٣- لەلای خۆمان لە هەندێ نوسیندا کیوبیزم بە شەش پاڵو خوازی یاخود شەش پاڵوگەرایی لـە شـەش پـاڵوەوە نـاوزەد کـراوە، لـە عەرەبیشـدا تەکعیبیـەت لـە وشـەی (مکعــب)ەوە وەرگیراوە. (وەرگێڕ).

## سـەرچاوەی بنــەڕەتی کــە ئــەم نووســینە سودمەند بوە لێی:

Degener, H. S., The Teach Yourself History of painting, The XX th G. Vol. X, London: English Universities Press., Ltd. 1955.



پۆڵ ناش، بازنەیەکی لیسۆگرافی تاك چاپ- ١٩٣٨.



بن نیکلسۆن، دیکۆری سیمفۆنیای حەوتی بالید ( جوڵەی چوارەم )، ١٩٣٩،
ڕۆنی لەسەرکانڤاس، ٣٨ × ٤٩ سم.



گراهام سوزەرلاند، هەواکێشی کارگەیەك و ڕۆژهەڵات، ١٩٢١، بۆیەی ئاوی،
٦٧ × ٤٧ سم.



ئێریك هیكل، مناڵێكی وەستاو، ١٩١٠، كۆڵینی تەختە، ٣٧ × ٢٧ سم.

